

# کچی خۆرهەڵات

خالید ئێرتوغروڵ


ناوی کتێب: کچی خۆرهەڵات

نووسەر: خالید ئێرتوغروڵ

وەرگێڕ: شەیدا عەلی

تیراژ: (٢٠٠٠) دانە

نۆبەی چاپ: یەکەم - ٢٠١٣

لەبەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە
گشتییەکان ژمارە (١٧٨٧)ی ساڵی
٢٠١٢ ی پێ دراوە





ناوەندی ڕاگەیاندنی ئارا

بنکەی سەرەکی بڵاوکردنەوەی بەرهەمەکانی ناوەندی ڕاگەیاندنی ئارا - سلێمانی / شەقامی پیرەمێرد
0770 358 7100 - 0750 106 9589 - 0748 013 4669 ara.m@hotmail.com

# پێشەکی



هەر دیمەنێك لە ژیانی کچی خۆرهـەڵات دیمەنێکـە لـە ژیـانی مـن و تـۆ، وێنەی کۆڵانەکانی هەموو شارێکی لەخۆگرتووە. لەم سەرگوزشتە سـەیر و سەمەرەیەدا هەموو کەسێك دەتوانێت خۆی بە پاڵەوانی چیرۆکەکە ببینێت و دیمەنەکانی ژیانی خۆی ببینێت.

لەبـەر ئـەم هۆیـە لـە ئامـادەکردنی ئـەم بەرهەمـەدا خـەمی ئافرانـدنی شـاکارێکی ئـەدەبی نـەخوراوە. ئـەم کتێبـەی کـە سەرگوزشـتەیەك دەگێڕێتەوە، کۆکراوەی بەسەرهاتەکانە و ئامانج لێی گەیاندنی پەیامێکـە. بۆیـە نابێـت بـە پێوەرەکـانی چـیرۆك یـان ڕۆمـان هەڵبسـەنگێنرێت. جگـە لەوەش بـە گشـتی کتێبەکـە ئاڕاسـتەی تازەپێگەیشـتووان و خوێنـدکارانی زانکۆ و کەسانی ئاسایی کراوە. لەبەر ئەمـە هـەوڵ دراوە ڕسـتەی کـورت و ئاسان بەکاربهێنرێت.

ئەگـەر دەتانـەوێت چـیرۆکێکی پـڕ پەنـد و ئامۆژگـاریی ڕاسـتەقینە بخوێننەوە، ئەوا بفەرموون ئێوە و کچی خۆرهەڵات...

# بەشی یەکەم



## هەموو شتێك كۆتایی پێ هاتبوو

من و ئەو...

دوو مرۆڤـی بێچـارەبووین کـە هـەر لـە تـافی لاویـدا لـە بەرامبـەر نەهامەتییەکانی ژیاندا چۆکمان دادابوو .

بڕیاری خۆمان دابوو. بۆ ئەوەی بە زووترین کات ئەو کارە بـە ئـەنجام بگەیەنین، لە درەنگانێکی شەودا ڕوومـان کـردە شـەقامێکی سـەرەکی کـە تەنانەت بۆ ساتێکیش قەرەباڵغی لێنابڕێت.

نیازی خۆمـان یـەکلایی کردبـووەوە. لـەم ژیانـەدا هـەموو ئومێـدێکمان هـەڵوەری و، گشـت ڕێگەچـارەکان بـە بنبەسـت گەیشـتن و، سـەرجەم هەوڵەکانیش بێسوود مانەوە.

ئەم ژیانە نەفرەتییە جگـە لـە دووڕوویـی و نیـازگڵاوی و ژان چـی تـری پێنەبەخشین. لە سەرەتای تەمەنی گەنجیماندا شەپۆلی ڕۆژگاری بێبەزەیی و بێپەروا لاشەی تازەگوڵکردوومانی پیرکرد. جـا ئیـدی بەردەوامیـدان بـەم ژیانە بەئازار چنراوە هیچ مانایەکی هەبوو؟

لەم ڕێی ژیانەدا کە بە خەونە ئەرخەوانییەکان دەستمان پێ کردبـوو، من و پناری هاوڕێم هەموو خەونە جوانـەکانمان بوونـە نەخشـی سـەر ئـاوو

لەناوچوون. لەگەڵیشیاندا هەموو بەها مرۆییەکانی خۆمان لەدەست دا و بووینە دوو مرۆڤی زیادەی بێکەڵکی ژێرپێی خەڵك. بۆیە هەموو ساتێك هەزاران جار نەفرەتمان دەکرد لە هاتنە دنیامان .

" با بەس بێت ئەم ئەشکەنجەیە."

بێزاربووین لەو " ڕێی ژیان "ەی کە هەموو جوانییەکانی لێزەوتکردین و " ڕێی مردن "مان هەڵبژارد.

ناویان نابووم ئومێد، بەڵام ئەوە هیچ سوودێکی نەبوو! من لەناو نائومێدیدا نوقم بووبووم و بەجارێك هەموو هیوام وشك بووبوو. لەگەڵ پناری هاوڕێم چووینە قەراغی ڕێگەیەکی سەرەکی دەرەوەی شار. جێیەکی بەرچاو نەبوو و، ئوتومبێلەکان بەوپەڕی خێرایی ڕێیان دەکرد. نەماندەویست بیدەینە دەست شانس. بەئەنقەست ئەم کاتە درەنگەی شەومان هەڵبژارد نەوەك کەس ڕێگریمان لێبکات، لای خۆی دوو گەنجی بیست و پێنج ساڵان بووین. ئەو تۆزە پارە وردەیەی کە پێمان مابوو دامان بە چۆرەکێك. تاقە چۆرەکێکمان کرد بە دوو لەتەوە و ویستمان برسێتی بێئامانی زگمانی پێ دامرکێنینەوە. سەرو تیشێرتێکی سادەمان لەبەردابوو. هاوین نەبوایە بەدڵنیاییەوە ڕەق دەبووینەوە. پێڵاوەکانی پێشمان شڕ و وڕبوو. ئەوەی لە دواشمان جێدەما هەر ئەم چەند شتە بێبەهایەبوو.

ئـەی ئێمـە؟ ئـەی ڕۆحمـان؟ ئـەی ئـەو زریانانـەی لـە کەللەمانـدا هەڵیـدەکرد؟ ئـەی ئـەو ئازارانـەی سـەرتاپای ژیانیـان ئـەنجن ئـەنجن کردبووین؟

بـەبڕوای خۆمـان بڕیـارێکی دروسـتمان داوە. تەنانـەت گوێشـمان بـەو زایەڵەیە نەدەدا کە لە ناخماندا هاواری دەکرد: " مەکەن! ئەم گیانـە خـوا داویەتی و تەنها خواش دەتوانێت بیسێنێتەوە !

پێویسـتبوو ئـەو کـارە بـەپایان بگەیـەنین. ئەگـەر هەوڵەکـەمان سـەر نەگرێت، کەس باوەشمـان بـۆ ناکاتـەوە و بەندەیـەکی خـوا نییـە دەسـتی یارمەتیمان بۆ درێـژبکات. خـۆ بـەو حاڵەمانـەوە وەك مردوویـەك وابـووین. گورچـیلەکانی پنـار سسـت بووبـوون و منـیش بـاری دەروونـیم ناتـەواو و سەرگەردان بووم.

دەستی یەکمان گرت و بۆ دواجار چاومان چووە سەر چاوی یەك. ئەمە ماڵئاواییەکی هەمیشەیی بوو. ئامادەبووین بۆ ئـەوەی خۆمـان بخەینـە ژێـر ئوتومبیلێکی تیژڕەوەوە .

لـە دوورەوە ڕووناکییـەك بینـرا. پێدەچـوو تەکسـی بێـت. زۆر خێـرا دەهات. خۆمان هەڵبدایەتە ژێری، بەدڵنیاییەوە نەیدەتوانی بوەستێتەوە و ڕزگارمان دەبوو. بەتەواوەتی نزیك بووەوە. چاوم نوقاند و کۆتـا هـاواری ژیانم کرد :"دەی"..!

هـەموو تەمـەنم وەك دیمەنـەکانی فیلمێـك بـەخێرایی بـە خەیاڵمـدا گوزەریان کرد، پاشان وردە وردە دوورکەوتنەوە و تاریك داهاتن.

## پێکەوە بەرەو مەرگ فڕین

دایکم و باوکم و ئەو سەدایەی دەروونم پێکەوە هاواریان دەکرد :

"مەکەن"!

چیتر هەلی گەڕانەوەمان نەبوو. لە چاوتروکانێکدا خۆمان لە ناوەڕاستی شەقامەکەدا بینییەوە. بەدوایدا دەنگێکی کاسکەر هەژاندینی:

"زرم"..!

دوایین دیمەنی ژیانم بچڕا و تاریک داهات.

نازانم چەندێك کات تێپەڕی. خولەکێك، یان سەعاتێك، یاخود ساڵێك، یان لەوانەشە سەدەیەك؟

خۆمم لە دنیایەکدا دیتەوە کە بێتوانام لە ناولێنانی، لە بنکی بیرێکی قووڵدا کە ڕزگاربوون لێی ئەستەمە. دەتووت بە هەزاران مەکینەی بڕەر لە لاشەمدا کاردەکەن و چەندەها مەکینەی گۆشت چوونەتە ناو یەك بە یەکی خانەکانی جەستەمەوە و دەمهاڕن. دەنگی قیژە و هاواری پنار کە دەیووت: " بمکوژن، نامەوێت بژیم! "، لە دوورەوە دەهاتە گوێم و تێکەڵ بە بوونم دەبوو.

سەدایەك لە دەروونمدا دەیچرپاند:

"ئێمە مردووین یان دەژین؟ داخۆ ئەمەبێت ئەوەی پێی دەگوترێت مەرگ؟ ئەگەر وابێت، ئەوەندە ژانێکی تاقەتپڕووکێنە کە هەر لە ئێستاوە پەشیمانم لە هەوڵی خۆکوژی. گوایە قوتارمان بووبوو لە چنگی ئازارەکان. گوایە دەحەواینەوە و هەناسەیەکی ئاسوودەمان هەڵدەمژی. ئەی کوا؟

لەوانەشە ئەمە ئەوەبێت کە پێی دەڵێن سزای دۆزەخ، بەڵام ئەگەر ئەمە تەنها سەرەتاکەی بێت، وەی بە حاڵمان " !

نەمدەتوانی چاوەکانم بکەمەوە. دەمبیست، وەلێ نەمدەتوانی بجووڵێمەوە. هەموو گیانم لەناو ئازار هاواری دەکرد. ئەمە چ جۆرە بەلایەکە ئەی خوای گەورە؟ وتم:

"کەس نییە یارمەتیمان بدات؟ کەس نییە ڕزگارمان بکات؟"

بەڵام کێ گوێی لە ئێمە دەبوو؟

دەنگێکی شیرین و دڵنیایی بەخش، وتی:

- ڕزگارت دەبێت ڕۆڵەکەم.

وەختێك بەحاڵ چاوەکانم هەڵهێنا، پیاوێکی باڵابەرزی چوارشانەی سیماڕوونم دی کە خۆشەویستی و میهرەبانی لە ڕووخساری دەتکا. هەموو گیانم بە لەفاف پێچرابوو، ئاو و خوێنم بۆ هەڵواسرابوو. چەندەها ئامێر و کەرەسەی خوێناوی لە دەوروبەرم بوون، وە چەندین کەسی سپی پۆش...

بۆ ئەوەی لەوەی کە دەژیم دڵنیابم، بەوپەڕی هێز قیڕاندم:

- من لە کوێم؟

ئەو پیاوەی بەسەرمەوە ڕاوەستابوو نووشتایەوە و، وتی:

- سوپاس بۆ خوا ڕۆڵەکەم. دەی چاوت ڕوون، پەروەردگار جارێکی تر ژیانی پێدایتەوە و ڕزگاری کردیت.

هیچ تێنەگەیشتم.

"خوا بۆچی ئێمە ڕزگاربکات؟ ئێمە چ سەودا و مامەڵەیەکمان لەگەڵ ئەودا هەبووە؟ ئێمە هەرگیز ئەوەمان نەکردووە کە ئەو وتوویەتی و هەمیشە سەرپێچیمان کردووە. ئەو ئێستا ئێمەی ڕزگارکردووە؟ کێ چاکەیەکی ئاوا دەکات؟ لەم دنیایەدا کە بەرژەوەندی و سوود پەیوەندییەکان یەکلایی دەکاتەوە، کێ چاکەی بێبەرامبەر دەکات؟"

هەوڵمدا هۆشم کۆبکەمەوە. بەڵێ، ئێرە نەخۆشخانە بوو. تووڕەبووم لەوانەی دەورم:

- ئێمە نەمردووین؟

- نەخێر، تۆ دەژیت ڕۆڵەکەم. دووبارە ئەو پیاوە سیما خۆشەویستە چوارشانەیەبوو.



ئێمە بۆ نەمردین...

کاتێک زانیم لە ژیانـدام کەوتمـە قیڕانـدن و هەڵشـاخان بەوانـەی دەوروپشتمدا.

- ئێمە بۆ نەمردووین؟ بۆچی ئێمەتان ڕزگارکرد؟ بۆ ئـەو خراپەیـەتان لەگەڵ کردین؟ هەموو نەخشەکانتان تێکدا. چەند خـۆش بـوو، بـۆ خۆمـان ڕزگارمـان دەبـوو لـەم دنیـا نەگریسـە. نـە دەهـێڵن وەك مـرۆڤ بـژین و نـە دەشهێڵن بمرین. ئەمە کەی وەزع و ئەمە کەی حاڵە، وەڵا تێناگەم!

ئەوەندە هۆشم لای خۆم نەبوو بزانم چی دەڵێم و، چـی دەبـزڕکێنم و، چـەند جـوێن دەدەم. گـوێم لێبـوو دکتـۆرە سـپی پۆشـەکە بەهانەیـەکی هێنایەوە بۆ ئەم ڕەفتارە ناشرینەم، وتی:

- هێشتا نەهاتووەتەوە هۆشی خۆی.

لەناکاو بیری پنارم کەوتەوە. قیڕاندم:

- ئەو لە کوێیە؟

تێگەیشـتن مەبەسـتم لـە " ئـەو " کێیـە. پیـاوە باڵابەرزەکـە وەڵامـی دامەوە:

- ئەویش زۆر باشە ڕۆڵە گیان. وابزانم ئەو پیاوە تاقـە پیـاوی ڕاستگۆ بوو کە لە هەموو تەمەنمدا هاتبێتە ڕێم.

من نەمدەزانی بێدەنگبوون چییە.

- خۆکوشتنیش سوودێکی نەبوو. هەرچییەك بکەین سەرناگرێت. باشە لەم دنیا نەفرەتییە ڕزگارمان نابێت؟ هەرگیز بەلا و ناخۆشی یەخەمان بەرنادات؟ قەت ڕۆژێکی خۆش نابینین؟

پیاوە خوێن شیرینەکە نووشتایەوە و، وتی:

- ڕزگارتان دەبێت ڕۆڵەکەم. خواگیان ڕۆژی خۆش و جوان نیشانی ئێوەش دەدات.

یەك لەسەر یەك بتڵی خوێنەکان دەگۆڕران و، لەفافەکان ئاڵوگۆڕ دەکران و، پەیتا پەیتا دەرزی ئازارشکێنم لێدەدرا.

دەموچاو و قۆڵەکانم و قاچم پێچرابوو. ئازارێکی تیژ لە پشتمدا خەریك بوو هەناسەی لەبەر دەبڕیم.

نەمردین، نەمانتوانی بمرین!.. نەمانزانی خۆکوشتنیش ڕزگاربوون و ئاسوودەبوون نییە. بەڵکو بەپێچەوانەوە ئازار و داخ و مەینەتییەکان هەزاران جار پتر دەکات. هەرواش بوو.

ئاه، لەو ڕۆژە ناخۆشانەی نەخۆشخانە! نازانم لە کوێوە بیگێڕمەوە.. چۆن باسی بکەم؟ نەخۆشخانە ئەوەندەی تر باری شانمانی قورستر کرد. ئەگەر ئەو دوو مرۆڤە باشە نەبوونایە، حاڵمان چۆن دەبوو؟ بەخۆڕایی نەیانووتووە: " ساڵ بە ساڵ خۆزگەم بە پار ".

هەشت مانگی ڕەبەق لەنێوان بوون و نەبوون، ژیان و مردندا هاتین و چووین. لەو ڕێ پڕ هەڵدێرەدا کە لێوان لێوە لە ژان و بێتاقەتی و، بارێکی

هێندە گرانە کە جەستە و دەروونی مرۆڤ توانای هەڵگرتنی نییە، گەر ئەو دوو مرۆڤە چاکەکارە یارمەتییان نەدابنایە حاڵمان چلۆن دەبوو؟!

کەواتە هێشتا مرۆڤی باش لە دنیادا ماوە. ئەوەندە کەسی خراپ و نیازپیس هاتنە سەر ڕێمان وامان زانی هەموو کەسێك خراپە. هەڵەکەشمان هەر لەمەوە دەستی پێکرد و تا لێواری خۆکوشتنی هێناین.

بەڵێ، ئەو مرۆڤانە...

نازانم بڵێم فریشتەی ڕزگارکەر، ئەهلی دڵ، یان خدری زیندەن؟ هەڵبەتە دنیا تا ئێستا کە ماوە لەبەر چەند کەسێکی پاکی وەك ئەمانەیە.. ئەگینا چ هۆیەکی تر هەیە ڕێگری لە وێران بوون و دارمانی بکات؟

## ناچاربووین درێژە بە ئەشکەنجەی ژیان بدەین

من و پنار گەڕاینەوە بۆ ژیانی پڕ لە ڕەنج و نائومێدی لە کوێ وەستابووین لەوێوە دەستمان پێ کردوە. بەڵام ئەمجارەیان چەندەها ئەوەندە بەسوێتر..

بەهۆی نەشتەرگەرییە یەك لەدوای یەکەکانەوە شوێنێکم نەمابوو نەبڕێت و نەدووررێتەوە. قاچەکانم، دەستەکانم، جومگەکانم، ڕیخۆڵەکانم...

نازانم کامیان باس بکەم. چەند تەنێك ئاسن لاشەمی شێلابوو و، ئەوەی کە مابۆوە تۆپەڵێك گۆشتی قیمەکراوبوو.

که خوا نەتمرێنێت مردنیش بەئاسانی دەستگیرنابێت. تێگەیشتم گەورەترین ئازاری مرۆڤێك ئەوەیە نەتوانێت بمرێت. واتە مردن لەچاو نەمردندا خۆشی و بەهارە..

ئەی پنار؟ ئەو هەزار جار حاڵی لە من خراپتربوو. خۆی پێش ئەم کارەساتەش لە سەرەتای لاوێتیدا تەندروستی لەدەستدابوو و، گورچیلەکانی سست بووبوون و، کچێکی غەریبە و بێکەس بوو.

کاتێك توانیم بە عەرەبانە بچم بۆ لای، زانیم چی بەسەر هاتووە. ئەو چرکەساتەی کە چاومان بە چاوی یەك کەوت.. وەختێك لەسەر پێخەفەکە ئەوم بە شەکەتی و نیوەمردوویی و لاوازی بینی، گشت ئازارەکانی خۆمم بیرچووەوە. دەتووت لە ئەنجامی بەرکەوتنێك جەستەی پارچەپارچەبووە و پاشان بەهۆی پەرجوویەکەوە(موعجیزە) لکێنراونەتەوە. سەرتاپای بە برینپێچ پێچرابوو. تەنها بە هەستان و نیشتنەوەی هێواشی قەفەزی سنگی دەزانرا کە دەژی.

بە هەزار حاڵ پێڵووی هەڵهێنا و بە نیگای خەمگین و ماندوو لێی ڕوانیم، وەك ئەوەی بڵێت : " چ خەبەر؟ ". ئەو حاڵەی زۆر ئازاری دام. ئەو هاوڕێیەی کە پێکەوە ڕێی مەرگمان هەڵبژارد، نازانم دەبوو چی تر بکات بۆ ئەوەی مردنێکی ئاسایی دەست بکەوێت؟

چوار نەشتەرگەری بۆ کرابوو. جێیەکی نەمابووەوە نەکرابێتەوە و نەدووررابێتەوە. قاچی ڕاستیان لە ئەژنۆی بەرەوخوار بڕیبووەوە. دەستی ڕاستیشی تەنها دوو پەنجەی دەیانتوانی کاربکەن. واتە کەمئەندامییەك کە

بەدرێژایی تەمەنی لەگەڵی دەبوو... وەرە و بەرگەی ئەم داخ و پەژارەیە بگرە!

ئێستا چی دەکرد پنار بەم حاڵە پەرێشانەیەوە؟ کێ یارمەتی دەدا و کێ پشتیوانی لێدەکرد؟ قاچێکی بڕاوە و جەستەیەکی کەمئەندام و گوچیلەکانی سست...

کە قاچی پنارم بینی خۆمم پێ ڕانەگیرا و قیژاندم:

- وەرن لێرە بمبەن! سۆیەك چووەتە دڵمەوە خەریکە دەمخنکێنێت.

ڕۆژ بە ڕۆژ ئەم ژیانە تاقەتپڕووکێنە گرانتر و گرانتر دەبوو. هەزاران جار پەشیمان بووم لە ژیانم.

گێژاوی پرسیارەکان مێشکمیان هەراسان کردبوو: " ئێمە بۆ نەمردین و ڕزگارمان بوو؟ چ چاکەیەکمان هەبوو تا ڕێ لەوە بگرێت؟ مەگەر کەسێك کە بەدرێژایی ژیانی کارێکی جوان و چاکی لە دەست نەوەشابێتەوە و، هەمیشە سەرپێچی خوا و یاساکانی کردبێت، چاکەی دەبێت؟ بە چ مافێك ئێمە دەژین؟ گیانی ئێمە بدەن بەوانەی دەیانەوێت و مردنیش بە ئێمە.. دیارە ئەم ژینە ئەوەندە نادادپەروەرە کە مافی مردنیش نادات. ئەمە چاکەیەکە لەگەڵمان کراوە یان بەردەوامیدانە بە ئازاری تەواونەکراوی تەمەن؟

ئاه، سەرم ژان دەکات و گێژ دەخوات، دڵم تێکەڵ دێت.. بیرکردنەوەکانم وەکو تیری ژەهراوی لە دڵم هەڵدەچەقین. خەیاڵی ڕەش و نووتەك تەنیبوومی و هیچ هیوایەکی بۆ نەهێشتبوومەوە. دەتووت لە

کەللەمدا چەندەها پرسیار شەپیانە لەگەڵ یەك: " وا لەم نەخۆشخانەیەش بەپێی خۆمان چووینە دەرەوە، جا چی دەگۆڕێت؟ وا بووینەوە بە مرۆڤە تەندروستەکەی جاران، چ سوودێکی هەیە؟ هەر ئازارەکەی جاران، دیسان مەینەتییەکانی ڕابردوو.."

هەوڵدان بۆ ڕزگارکردنی دوو کەس کە سەرتاپایان لە لیتاوی پیسی ژیاندا نغرۆبووە، چ ئەنجامێکی دەبێ؟ دیسان کۆمەڵێك دۆستی ساختە پێشوازیمان لێدەکەنەوە، دیسان خووە خراپ و زیانبەخشەکان، ماددەی بێهۆشکەر و، پاشان ئەو ژۆنگاوەی کە ئێستا بە نەفرەتەوە یادی دەکەمەوە...

## پێچەوانەی مرۆڤ بوون چەند خراپە

بەلامەوە ئاژەڵان لە ئێمە زۆر پاك و بەڕێزتربوون. بەلایەنی کەمەوە ڕەسەنێتی و ڕاستگۆیی و گیانی هاوکارییان تێدایە. شیر و، گۆشت دەدەن و، هێلکە دەکەن، بلێی " وەرە " دێن و، بلێی " بڕۆ " دەڕۆن. تەنانەت جۆرێك لە ژیانێکی گونجاو و تەبا و سادە و بەختەوەریان هەیە بەگوێرەی خۆیان.

ئەی بوون بە مرۆڤ؟

مرۆڤ هەر هێندەی لە ڕێ بترازێت و پێوەرێکی نەبێت ئیتر هەموو ڕەفتارە خراپەکان دەبنە بەشێك لە سروشتی و لە ئاژەڵ زیانبەخشتر و ترسناکتری لێدێت.

دیسان داڵغە بردمیەوە. دیسان کەوتمەوە شەڕ لەگەڵ ژیان و ناڕەحەتییەکانی ناوی. باشە، ئێمە لەمەدا هیچ تاوانێکمان نەبوو؟ بێگومان هەمانبوو، بەڵام تازە کار لە کار ترازابوو.

ئاه، خۆزگە زوو لەم نەخۆشخانەیە ڕزگارمان دەبوو. ئەوکات دیسانەوە هەوڵی مردنمان دەدا. بەڵام ئەمجارەیان بێئەوەی بچووکترین شوێنەوار لەدوای خۆمان بەجێبهێڵین. پێویست بوو ئەو کارە بەسەلیقە ئەنجام بدەین. دەرکەوت کە خۆکوشتنی نەزانانە دەرەنجامێکی نابێت.

نزیك بووبووینەوە لە کۆتایی هەشت مانگی پڕ لە چەرمەسەری و ناڕەحەتی. هەشت مانگ..!

ئەو ڕاڕەوانەی کە بۆنی دەرمانیان لێدەهات.. سیسەمە بێبەزەییەکان کە هەموو گیانمانیان پارچە پارچە کردبوو.. کارمەندانی تەندروستی سپیپۆش کە تاو نا تاوێك بە سرنجەکانی دەستیانەوە دەردەکەوتن.. چاوەڕوانیی دڵتەزێنی پێش نەشتەرگەری.. ئەمانە و چەندەها ڕووداوی تاقەتپڕوکێنی تر ڕۆژانی نەخۆشخانەی ئێمەیان پێکهێنابوو.

لەپاش هەشت مانگی ئا لەم جۆرە ئیتر کاتی دەرچوون هاتبوو. زوو زوو لەگەڵ پنار یەکمان دەدی و دەردەدڵی بێچارەیی و هیوابڕاوی خۆمان دەکرد.

ئەو قاچە دەستکردەی بۆ پناریان دروست کردبوو، زۆری ویست تا جێی خۆی گرت. پنار کەسێکی زۆر خۆڕاگربوو. بەئاسانی بڵێسەی ناخ و ژانی ڕۆحی نیشانی دەرەوە نەدەدا. دەیووت: " باشە، لەمە باشتر نابێت!

دەبێت بەم ژیانە ڕابێم. ئەگەر بمانەوێت بژین چارەیەکی ترمان نییە. هیچ نەبێت تا مردنێکی باش بەنسیبمان دەبێت پێویستە خۆڕاگربین"...

مردنی باش؟ بەڵێ، مردنی باشیش هەبوو، یاخود مردن لەچاو ئەم ژیانەدا باشتربوو.

بەڵام سەرەڕای هەموو ئەم ئازارانەش، ئەی ئەگەر ئەو دوو کەسە فریشتەئاسایە نەهاتنایەتە ڕێمان؟ ئەی ئەگەر خاوەنی ئەو ئۆتومبیلەی کە لە شەوێکی درەنگدا بە مەبەستی خۆکوشتن خۆمان فڕێدایە ژێری، لەوێدا بڕۆیشتایە و لای لێ نەکردینایەتەوە؟ ئەوکات حاڵمان چۆن دەبوو؟

لەگەڵ ئەوەشدا کە ئەم دوو مرۆڤە وەك باوك و دایکێکی میهرەبان هەموو کاتێك لەگەڵمان بوون و گشت پێداویستییەکانیان فەراهەم کردین و خەرجی نەخۆشخانەیان بۆ داین، کەچی ئەو هەموو ڕەنج و ناڕەحەتییەمان کێشا. ئەی ئەگەر کەسانی تر بهاتنایەتە ڕێمان چیمان دەکرد؟

## ئەو چەمکی "خوا"یەی لە مێشکمدا دروست بوو بوو

لەم ڕووداوە بەدواوە چەمکی " خوا "، کە ساڵانێکی دوور و درێژ بە چەقبەستوویی مابووەوە لام هاوڕێ لەگەڵ بڕیارە پێشوەختەکانم هەمووی بە جارێ گۆڕا.

بیرم ئاڵۆز بوو. چەندەها پرسیاری بێ وەڵام لە کەللەمدا مشتومڕیان بوو. ئێمە دەمانەوێت بمرین، خۆمان هەڵدەدەینە ژێری ئۆتومبیلێك و هەوڵی خۆکوشتن دەدەین، بەڵام هێزێکی نادیار هەموو کارەکانمان پووچەڵ دەکاتەوە. سەرەڕای ئەوەش دوو کەسی چاکەکارمان بۆ

دەنێرێت کە بە گیان و دڵ یارمەتیمان دەدەن. باشە، بۆچی؟ بۆچی ئەو یارمەتیمان دەدات؟ لە کاتێکدا ئێمە لە ڕابردوودا سەرپێچیکاربووین بەرامبەری و زۆرکات باوەڕمان هەر پێی نەبووە و، لە ڕقدا زۆربەی جار بەرهەڵستی فەرمانەکانیمان کردووە. ئەمە گرنگترینی ئەو نەزانراوانەبوو کە مێشکمیان هەراسان کردبوو.

کاك ڕەسوڵم بە زەردەخەنەیەکی شیرینەوە ـ کە ئارامی بە دەروونی مرۆڤ دەبەخشی ـ لە بەرامبەرمدا دیتەوە. خاوەنی ئەو ئوتومبیلەی ئێمەی کردبوو بەژێرەوە... لە تەنیشتیشیدا مەدینە خان کە چەشنی دایکێکی میهرەبان چاودێری دەکردین و بەدەم بچووکترین داخوازیمانەوە وەك پەروانە هەڵدەسووڕا.

بەدرێژایی هەشت مانگی تەواو جێیان نەهێشتین. ئەوەتا ئەم بەیانییەش بەزوویی هاتوون بۆ دیدەنیمان. وەك پیشەی هەمیشەییشیان لێوبەخەندە و بە دەستی پڕەوە هاتوون.. مەدینە خان چوو بۆ قاوشی ژنان و پناری هێنا بۆ لامان. هەرلەویادا گروپێکی چوار کەسیمان پێکهێنا.

# بەشی دووەم



## مرۆڤە فریشتە ئاساکان

هێشتا بەتەواوی ئەو دوو مرۆڤە خاوێنەمان نەناسیبوو، تەنها ئەوەم دەزانی کە خاوەنی ئەو ئۆتومبیلەن کە ئێمە خۆمان فڕێداوەتە ژێری و، ئەوانیش بەزوویی ئێمەیان گەیاندووەتە ئەم نەخۆشخانەیە. ئەگەر قسەکانی پەرستارەکە ڕاست بێت، کاک ڕەسوڵ دکتۆرە و مەدینە خانیش مامۆستایە. لە هەمووشی گرنگتر ئەوەبوو کە باشترین کەسانێك بوون تا ئەو کاتە ناسیبێتم .

هەر کاتێك ئەم دوو مرۆڤە شیرینە دەهاتن بۆ لامان دڵیان دەداینەوە و، کەشێکی خۆشیان دەخوڵقاند و، مانادارترین و ناسکترین چرکەساتەکانی ژیانمان بەسەردەبرد. بۆیە هەردەم چاومان لەڕێیان دەبوو و بیرمان دەکردن. بەتایبەتی ڕەوشتی جوانیان کاری زۆری لە من دەکرد.

زمانی شیرین و دڵی گەرم و ڕەفتاری پڕ لە میهرەبانییان تا ڕادەیەك زریانی نائومێدی ناخمیان دادەمرکاندەوە و، بۆ یەکەمجار هەستم دەکرد بەوەی کە وەکو (مرۆڤ )ێك مامەڵەم لەگەڵ دەکرێت. تێگەیشتم کە گەورەترین چاکەیەك بەرامبەر بە کەسێك بکرێت ئەوە نییە دەستگیرۆیی

ماددی بکرێت، بەڵکو بریتییە لە مامەڵەکردنی مرۆڤانە لەتەکیدا. لەوانەشە هۆی ئەوەی کە ئەم ڕەفتارەیان زۆر کاری لە ئێمە کرد ئەوەبێت کە ئێمە لە ژیانماندا چاکەیەکمان لەگەڵ نەکرابوو لە بەرامبەریدا داوای شتێکمان لێ نەکرابێت. یاخود هۆکارەکەی ئەوەبێت کە چەند بەکەڵك هاتبین کاریان پێکردووین و پاشان توورپیان داوینەتە کەنارێکەوە.

لەو کاتەدا کە ئێمە سەرگەرمی گفتوگۆبووین، پیاوێکی ڕێکپۆشی پاکوخاوێن لە دەرگاکەوە بەدەرکەوت. کاك ڕەسوڵ و مەدینەخان هەرکە بینییان یەکسەر هەستانە سەرپێ. کاك ڕەسوڵ وتی:

ـ کاك ئەحمەد، ئەوە تۆیت؟ یاخوا بەخێربێیت سەر سەر و سەر چاو!

باوەشیان کرد بە یەکدا ..

ئای خوایە ئەوە چ دۆستایەتییەکی جوان بوو! ئەوە چ گەرم و گوڕییەك بوو! چ هاوڕێیەتییەکی شیرین بوو! مەحاڵ بوو مرۆڤ ئیرەییان پێنەبات. خۆزگە لەناو ئێمەی گەنجانی بەناو ڕۆشنبیر و پێشکەوتوودا بۆ تەنها یەك جاریش تامی هاوڕێیەتییەکی ئاوا پاکمان دەکرد! بەڵام ئێمە لە کوێ و دۆستایەتی بێ فرتوفێڵ لە کوێ؟! جگە لە فریودان و ناپاکی و سوودپەرستی و بێهەستی، هیچی تر نەدەهاتە ژیانمانەوە .

تا دەهات باشتر لەوە تێدەگەیشتم هۆکاری ئەوەی بەسەر من و پنار هات ئەوەبوو کە ژینگە و کەسانی باشمان هەڵنەبژاردبوو. بەتایبەتی کاتێك ئەو ڕووداوە نەگریسانەم بیردەکەوتەوە کە بەسەر پنار هاتبوون و

چەندەها جار پاڵیان پێوە نابوو تا لێواری خۆکوژی، هێندەی تر داخ و ئازارم پتر دەبوو. بەڵام بەداخەوە تازە هیچم لە دەست نەدەهات .

کاک ئەحمەد کەسێکی ڕۆشنبیر و خوێنشیرین و خاکی بوو. کاک ڕەسوڵ، ئەوی پێ ناساندین:

ــ کاک ئەحمەد پرۆفیسۆرێکی ناوازەیە و تازە لە ئەمریکاوە گەڕاوەتەوە بۆ نیشتمان. پزیشکێکی سەرکەوتوو و زانایەکی ناسراوە لەسەر ئاستی جیهان. وا مەڕوانن کە زۆر خاکی و خۆبەکەمزانە! بێگومان کاک ئەحمەد بەئاسانی بەم ڕۆژانە نەگەیشتووە. ڕەنج و مەینەتی زۆری چەشت. مەگەر تەنها خوا خۆی بزانێت، پاشان خۆی و ئێمە..

بینیم کاک ئەحمەد بەم ستایش و پیاهەڵدانە لە شەرمدا سوور هەڵگەڕا و سەری داخست. دیاربوو سەرگوزەشتەی ژیانی، وەکو ئەوەی ئێمە سەیر و سەمەرەیە.

## خێزانە کوژراوەکە

لەنێو کەشێکی بێدەنگ و هێمندا گوێبیستی چیرۆکی ئەو ژیانە پڕ لە پەند و عیبرەتە بووین. کاک ڕەسوڵ وتی:

- کاک ئەحمەد لە گوندێکی بچووکی چەپەکی خۆرهەڵات لەدایك بووە. گوندەکە ئەوەندە دوورەدەستە تەنها بەپێ، ئەویش زۆر بەزەحمەت دەتوانیت بیگەیتێ. کاتێك لە پۆلی حەوتەمی بنەڕەتیدا دەبێت، بەهۆی کێشەیەکی دوژمنایەتی دێرینەوە هەموو ئەندامانی خێزانەکەی لەدەست دەدات. لە کاتی ئەو ڕووداوە بێبەزەییەدا ئەم لە قوتابخانە دەبێت و

بەتەنها خۆی ڕزگاری دەبێت. بۆیە ئەحمەد بێ کەس و بێ دەر گەورەبووە.

ئەگەر ئێمە لە ڕۆحی ئیسلام تێبگەیشتینایە، کە باوەشی بۆ هەموو زمان و ڕەنگ و نەتەوەکان کردووەتەوە و هەموان بۆ پێکەوەژیان بانگهێشت دەکات، کارەساتی لەم جۆرە ڕوویندەدا .

ئیتر ئەحمەد ئەو گوندەی بە خۆی و یادگارییە تاڵەکانیەوە جێهێشتووە و بەوپەڕی لێبڕانەوە هەوڵی خوێندنی داوە. پێویست بوو سەرکەوتووبێت، چونکە ئەوە تەنها ڕێگەبوو کە دەیتوانی خۆی لە زیانی ئەو خراپکارانە بپارێزێت. ئەحمەدیش لە نێوان (سەرکەوتن) و (مردن) دا بە هەموو هێزی هەوڵی سەرکەوتنی دا. وتەی بەناوبانگی: " بەندە داوای چی بکات خوا دەیداتێ" ی کرد بە سەرمەشقی خۆی و قۆڵی لێ هەڵماڵی. هەنووکە خەڵکی باس لە سەرکەوتنی ئەم دەکەن.

لە پۆلی هەشتی بنەڕەتی لەگەڵ ئەحمەد یەکمان ناسی و پێکەوە لە یەك بەشی ناوخۆیی بووین. لە شارێکی گەورەدا دەماینەوە و هەموو لایەك پڕبوو لەو کەسە چەپەڵانەی کە بازرگانی بە مرۆڤەوە دەکەن. دەبوو هەم خۆمان لەو کەسانە بپارێزین و، هەم بەپێوە بمێنینەوە و نەڕووخێین، هەم لە خوێندنیشدا سەرکەوتووبین. ئەمەش کارێکی زۆر گران بوو.

بەیانیان دەچووین بۆ قوتابخانە تا نیوەڕۆ دەمانخوێند. پاشان لە نیوەڕۆوە لە چێشتخانەیەك کارمان دەکرد تا نیوەشەو. جارێك خزمەتی مشتەریمان دەکرد و جارێك قاپمان دەشت. جاری وا هەبوو کاتمان

نەدەمایەوە بۆ نووستن و بە چاوی خەواڵووەوە ڕێمان دەکرد و دەچووین بۆ قوتابخانە. ناچاربووین... هیچ چارەیەکی ترمان نەبوو جگە لە سەرکەوتن و کۆڵنەدان .

من خۆم باوکمم هەرگیز نەدیوە. تەنها دایکێکی پیر.. ئەویش سەروەتێکی ماددی نەبوو تا بۆمی جێبهێڵێت. بەڵام دوعا زۆرەکانی و دڵە میهرەبانەکەی هەمیشە ناخی پڕدەکردم لە خۆشەویستی. وەکو باسم کرد ئەحمەدیش نە دایکی هەبوو نە باوك.

لەو ڕۆژگارەدا خولیا و داڵغەی گەنجێتی لە کەللەی دابووین. سەیری حاڵی خۆمان نەدەکرد و لاسایی خەڵکی ترمان دەکردەوە و ئیرەییمان پێدەبردن. زۆرجار بەهۆی دەستکورتی و بێکەسیمانەوە لەنێو هاوڕێکانماندا تەریق دەبووینەوە و، خەفەتمان بەوە دەخوارد کە ئێمەش وەکو ئەوان ناتوانین ڕابوێرین و بە دڵی خۆمان بژین. جاری واش هەبوو هاوڕێکانمان دەهاتن بۆ ئەو چێشتخانەیەی ئێمە کارمان لێ دەکرد و، بە کەیف و خۆشییەوە دەیانخوارد و دەیانخواردەوە و پێدەکەنین، ئێمەش خزمەت و بەردەسیمان دەکردن. مەگەر ئێمەش حەزمان نەدەکرد وەکو ئەوان بین؟ ئێمەش حەزمان لە کەیف و سەفای گەنجێتی نەبوو؟ بەڵێ، بەڵام ئێمە تەنها یەك ڕێگەمان لەبەردەستدا بوو. هەڵبژاردنێکی ترمان نەبوو. یا لە خوێندنەکەماندا سەرکەوتوو دەبووین، یان دەبووین بەژێر پێوە و شەرەف و سەربەرزیمان دەدۆڕاند و، دەبووینە جاش و داردەستی پیاوکوژان و نەگریسان.

بەڵام ڕووداوێکی زۆر سەیرمان بەسەرهات کە بووە خاڵی وەرچەرخان لە ژیانماندا. حەزدەکەم ئەحمەد خۆی بۆمان باسبکات.

## هەمان فیلم

کاک ئەحمەد بە شەرمەوە سەری بەرزکردەوە و، وتی:

ـ نامەوێت بگەڕێمەوە بۆ ئەو ڕۆژانە کاک ڕەسوڵ. من ئەو ڕۆژانە بە بەشێك لە ژیانم دانانێم. هەروەك خەوێك هاتن و ڕۆیشتن.

ـ نا نا، بیگێڕەوە. بیرەوەری مرۆڤ شتی زوو لەیاد دەچێت. بەداخەوە وانە جددی و گرنگەکان بەزوویی لەبیردەکات. با دیسان لە بیرەوەریماندا تازە ببێتەوە، پێویستمان پێیەتی.

تێگەیشتم. کاک ڕەسوڵ مەبەستی ئێمە بوو. ئەو زۆری لە کاك ئەحمەد دەکرد، تا ئێمە پەند و وانەی لێ وەربگرین. دەیویست بە گوێگرتن بۆ ئەم چیرۆکە هەڵەکانی خۆمان بۆ ڕوون ببێتەوە و بە خۆماندا بچینەوە. بەڵام تازە بۆ ئێمە زۆر درەنگ بوو. گەڕان بۆ سەرلەنوێ بنیاتنانەوەی ژیانێکی داڕماو بێسوودە. ئێمە لە کوێ و پەند وەرگرتن لە کوێ؟ ئاگرێکی وا ئێمەی سووتاندبوو پێویستمان بە هیچ وانەیەکی تر نەبێت. چ وانەیەك بە کەڵکی ئەو کەسە دێت کە پشتی لە ژیان هەڵکردووە و بەیەکجار قەڵەمی هێناوە بەسەریدا؟

کاک ئەحمەد هەرچۆنێك بێت دەستی پێکرد. ڕاستییەکەی سەرنجی ڕاکێشام، چونکە زۆر لە چیرۆکی ژیانی پڕ لە دەردیسەری ئێمە دەچوو.

بێ ویستی خۆمان، لەنێو ڕووداو و بەسەرهاتەکانی ئەو چیرۆکەدا خۆمان دەدیتەوە. کاک ئەحمەد وتی:

- خاوەنی چێشتخانەکە شەوێکیان درەنگ بانگی کردین. لەگەڵ کاک ڕەسوڵ چووینە ژوورەکەی. بە هەڵسوکەوتیدا دیاربوو کە دەستی لە کاری نایاسایی و ترسناکدا هەیە. ڕاستەوخۆ چووە ناو بابەتەکەوە. جانتایەکی ڕەشی نیشان داین و، وتی:

- بگرن منداڵەکان، ئێوە خۆ هەر بەوێدا تێدەپەڕن. ئەم جانتایە بگەیەنن بە فلان ناونیشان. خانمێك لێتان وەردەگرێت. سڵاوی منی پێبگەیەنن.

چونکە یەکەمجارمان بوو شتی وامان بەسەربێت بێ دوودڵی قبوڵمان کرد. جلەکانمان گۆڕی و جانتاکەمان هەڵگرت. سەعات نۆ یان دەی شەو ناونیشانەکەمان دۆزییەوە. بەشە ناوخۆییەکەی خۆشمان هەر لەو نزیکانەبوو.

دامان لە زەنگەکە و ئافرەتێکی گەنج دەرگاکەی کردەوە. سەرەتا لێمان وردبووەوە. پاشان بێئەوەی هیچ پرسیارێکمان لێ بکات بردینیە ژوورەوە. ئێمە هەرچەند ویستمان جانتاکە بدەین و بڕۆین، کەچی ئەو هەر سووربوو لەسەر ئەوەی بچینە ژوورەوە. ئێمە دوو خوێندکاری دواناوەندی شازدە حەڤدە ساڵان بووین و، ئەویش ئافرەتێکی جوانی سی و پێنج ساڵ بوو.

وامـان زانـی چـوینەتە بەهەشـتەوە. لـە ژیانمانـدا مـاڵی وا جـوان و کەشخەمان نەدیبوو. بە چاوی ئەبڵەقەوە لە چواردەوری خۆمان دەڕوانـی. ئافرەتە گەنج و مەکربازەکە فەرمووی لێکردین بۆ ساڵۆنێکی فراوان. وتی:

ـ فەرموون دانیشن کوڕینە. سەرەتا با بزانم برسیتانە یان نا؟

ـ ئێمە لە چێشتخانە کاردەکەین، برسیمان نییە.

سەری بەرزکردەوە و، وتی:

ـ نـا نـا، مـن چـاك دەزانم کـە چێشـتلێنەران هەمیشـە برسـین. خێـرا شتێکتان بۆ ئامادە دەکەم و پاشان پێکەوە قاوەیەك دەخۆینەوە .

چەند وتمان " نابێت، ئێمە تێرین "، دادی نەدا. پاش کەمێك بردینـی بـۆ چێشـتخانەکە. ئـای لـەو سـفرە و خوانـە ! لـە تەمەنمانـدا مێـزی وا ڕازاوەمان نەدیبوو. خواردنە بەلەزەت و جۆراوجۆرەکان، مەزە، مەی،...

من و ڕەسوڵ سەیری یەکمان کرد. سەرمان لە هۆکاری ئەم دەعوەتـە نائاسایيە سووڕما. ئـەم هـەموو سـەخاوەت و ڕێـزە بۆچـی؟ بـە شـەرمەوە لەسەر سفرەکە دانیشتین. لە بەرامبەریشماندا خـانمێکی گـەنج و جـوان... هەڵسوکەوتی بەناز و عیشوەی ئێمەی زۆر ناڕەحـەت دەکرد. ئێمـە کـوڕی پـاکی لادێ بـووین. هەرچـەند دیـن و ئیمـان و داب و نـەریت زۆر ڕەنگـی نەدابووەوە لە ژیانماندا، بەڵام دیسـانیش هێشـتا ئامـادە نـەبووین بـۆ ئـەو جـۆرە شـوێنانە. شـەرممان دەکـرد و، بێتاقـەت بووبـووین و، سـوور هەڵگەڕابووین. دەتووت پاروو بۆ چاومان دەبەین نەك بۆ دەممان .

پاش خواردنەوەی قاوەکان داوای ڕوخسەتی ڕۆیشتنمان کرد. ژنەکە خۆی بادا و، وتی:

- لێرە دەتوانن بمێننەوە کوڕینە! شوێنمان زۆرە، کام ژوورەتان دەوێت هەڵیبژێرن.

پێکەنین و قسەی بەمانا و خۆبادان چەند داوێك بوون نرابوونەوە بۆمان، دیاربوو کە کۆتاییەکەی ئەوەندە ئاسان نابێت. دەگونجا لە چرکەساتێکدا نەرم ببووینایە و بمانوتایە " دە قەیناکە با بمێنینەوە ".

چونکە ئیرادەیەکی بەهێز و عەقڵێکی بەئەزموونی وامان نەبوو بیر لەو مەترسییانە بکاتەوە کە لە داهاتوودا دێنە ڕێمان. بەڵام خوای گەورە یارمەتی داین و نەماینەوە.

دوو پاکەتی بچووکی دایە دەستمان. ژنە تەڵەکەبازەکە دەنگی ناسك کردەوە و، وتی:

- حەزدەکەم زوو زوو بتانبینم کوڕە قۆزەکان!

کاتێك پاکەتەکەمان کردەوە بەجۆرێك واقمان وڕما ناتوانم بۆتانی باسبکەم. پارەیەکی ئەوەندە زۆربوو بۆ ئەو سەردەمە، کە لە خەویشدا نەماندیبوو. بەو پارەیە مرۆڤ دەیتوانی لە ئوتێلێکی کەشخەدا بمێنێتەوە و، ژیانێکی شاهانە بژی و، بە کەیفی دڵی خۆی ڕابووێرێت. کەوابوو چ پێویستییەك بە خوێندن و خۆماندووکردن هەبوو؟ مەگەر بمانخوێندایە ئەوەندە پارەمان دەست دەکەوت؟

### ئەوانەی خرابوونە داوەوە

بیرمان تەواو پەرت بووبوو. وەلێ بنەڕەتیترین پرسیار ئەوەبوو کە ئێمە بە گواستنەوەی جانتایەکی سادە چ ئەرکێکی گرنگمان ئەنجامدابوو وا بە گەرمی پێشوازیمان لێبکرێت؟ یان لەوانەیە ئەو ژنە چاوی لە ئێمە بڕیبێت و کاری پێمان بێت؟ باشە ئەی بۆ کەسی تر نا و ئێمە؟

دوای چەند ڕۆژێك خاوەنی چێشتخانەکە دیسان بانگی کردینەوە. ئەمجارەش دیسان جانتایەك، بەڵام داوای لێکردین بیبەین بۆ ناونیشانێکی جیاواز. ڕاستیەکەی لەمەڕ ئەو پارە زۆرەی وەرمان دەگرت هەم دڵخۆش بووین و هەم دەترساین. دەمانزانی کۆتایی ئەو ڕێیە نەهاتە، وەلێ پارەش شیرین بوو. بەتایبەتی بۆ دوو گەنجی نەداری وەك ئێمە.

### پارە؛ ئاگرێکی سووتێنەر

کاتێك چووین بۆ ئەو ناونیشانەی پێمان درابوو هەمان کچی خزمەتکار دەرگای لێکردینەوە. بە هەڵسوکەوتی سەرنجڕاکێش و عەنعەنە و تەنتەنە فەرمووی لێکردین. ئێرەش ماڵێکی فراوان و دەوڵەمەند بوو کە هیچی لەوەی یەکەم کەمتر نەبوو. دەنگە دەنگ و قیڕە و هەرا لە ژوورێکەوە دەهات. کچەکە وتی:

- خەمتان نەبێت، هاوڕێیان گفتوگۆی بابەتێك دەکەن.

بەڵام ئەو هاوار و زرم و کوتەی لە ژوورەکەوە دەهات، زیاتر پێدەچوو هی شەڕ و ئەشکەنجەدانێك بێت وەك لە گفتوگۆ.

جانتاکەمان تەسلیم کرد. دیسان هەمان ڕێز و خزمەت و خواردەمەنی و قاوە. ئەو هات و هاوارەی ترسی خستبووە دڵمانەوە وەستا. دەرگاکان کرانەوە و داخران. زۆری نەبرد بێدەنگی باڵی بەسەر ژوورەکەدا کێشا. ئەمەش نیشانی دەدا کە گفتوگۆکە بە ڕووداوێکی تاڵ کۆتایی هاتووە نەک بە ڕێکەوتن. ترسێکی سارد سەرتاپای بوونمانی داگیرکرد. خەمی ئەوەمان لێنیشت کە داخۆ کۆتایی ئەم کارەی ئێمەش هەر لەو جۆرەیە؟ سەیری ڕەسوڵم کرد، ڕەنگی زەرد هەڵگەڕابوو. منیش حاڵم لەو باشتر نەبوو.

هەستاینە سەرپێ بە نیازی ڕۆیشتن، وەلێ ژنە سەرنجڕاکێش و خزمەتکارە بێشەرمەکەی بەتەما نەبوو بەئاسانی بهێڵێت بڕۆین. ژنەکە وتی:

- ئەمشەو میوانی منن! ناهێڵین بەم شەوە درەنگە بڕۆن. بەیانی بڕۆن. مەترسن، خۆشترین شەوی ژیانتان بەسەردەبەن!

لەناکاو سەرسامی و شڵەژان داگیری کردین. هەنگاو بە هەنگاو بەرەو پەیوەندی ترسناک و نهێنی پاڵمان پێوە دەنرا. دەمانزانی کە بۆ قوربانی هەڵبژێرراوین، بەڵام لەو ڕۆژانەدا بەهۆی مەستی لاوی و کاڵفامی، پێمان خۆشبوو. بەئاشکرا دیاربوو کە هەنگوینێکی ژەهراویمان پێشکەش دەکەن، وەلێ هەوا و هەوەسی گەنجێتی وای لێدەکردین بیر لە هەنگوینەکە بکەینەوە نەک ژەهرەکە.

سەرەڕای ڕەتکردنەوە و سووربوونمان، ناچاربووین ئەو شەوە بمێنینەوە. دوو ژووری جیاوازیان پێداین. شەو درەنگی کردبوو. ڕێک لەو

کاتەدا کە لە لێواری هەڵدێرێکدابووین، دەنگی تەلەفون وەکو دەستێکی ڕزگارکەر بەهانامانەوە هات. نازانین لەو تەلەفۆنەدا چی وترا و چ شتێکی نائاسایی ڕوویدا. پاش کەمێك ژنەکە بەپەلە خۆی کرد بە ژوورەکانماندا و، وتی:

– زۆر داوای لێبووردن دەکەم. ناچارم هەر ئێستا بتانێرم. لە داهاتوویەکی زۆر نزیکدا لە هەمان شوێنەوە دەست پێدەکەینەوە.

دیسان دوو پاکەتی بچووکی نایە مشتمانە و بەپەلەپرووزکێ ئەوێمان جێهێشت.

پارە... ژیریمانی خامۆش و داوەریمانی پەککەوتە کردبوو. لەجیاتی ئەوە ژیانی پڕ لە سەرگەرمی و ڕابواردن و مەستیی درۆیینە دەوری دابووین. نەماندەزانی بەو کارەی دەیکەین چەند گەنج و چەند مرۆڤ و چەند خێزان ماڵیان کاول بووە و، ژیانیان بووە بە دۆزەخ و، هیوایان هەڵوەریوە .

## لێکچوونێکی سەیر!

چۆن بەرگەی وەها دیمەنێك دەگیرا؟ هەربۆیە بێپەروا قسەکانم پێبڕی و وتم:

– ڕێك وەك ئێمە، هیچ پێویست ناکات بەدوای نموونەیەکی تردا بگەڕێیت. ئەوە ئێمەو ئەوە حاڵ و ڕۆژمان، ئەمانەی بەسەرمان هاتووە هەموو شتێك ڕوون دەکەنەوە.

لە حرس و تورەیی خۆم وا دانم بەیەکدا دەهێناو دەستە ساغەکانم تووند کردبوو بە مشت کە کاک ڕەسووڵ وتی:

– ئارام بە ئومێد گیان، ئێوە ڕزگارتان بوو، ئازارە بەسوێکانی ئەو ڕۆژانە ئیدی کۆتایی هات.

ئەمەی وت و هاتەلامەوەو وەك باوکێکی میهرەبان لە ئامێزی گرتم و دڵنەوایی کردم.

کاك ئەحمەد بەردەوام بوو، ئەوە تەنها چیرۆکی ژیانی ئەو نەبوو، بەڵکو ژیانی ملیۆنان کەسی بێلانەو بێسەرپەرشتی باس دەکرد کە بۆ مەبەستێکی خراپ بێبەزەییانە وردوخاش دەکران:

– لەبەرئەوەی ئەم پەیوەندییانەمان برادەرەکانی بەشی ناخۆیی بێزار کردبوو، لەگەڵ ڕەسوڵدا گواستمانەوە بۆ ئوتێلێکی پلە یەك. دوو قوتابی دواناوەندیی بێکەس و بێپشت و پەنا و نەدار لەپڕێکدا ژیانمان گۆڕا.. ،ەجۆرێك ئەو ئوتومبیلەی لەژێر ئێمەدابوو دەوڵەمەندان خەویان پێوە ،ەبینی. سەردەمی شاگردی تەواوبووبوو، لەبری ئەوە هەموو شەوێك سەرمان لە چێشتخانەکە دەدا و ئەو ئەمانەتەی پێمان دەدرا بەوپەڕی ،هێنییەوە دەمانگەیاندە جێی مەبەست. لەپاشیدا پارەی زۆر کە ئەبڵەقی کردبووین و چاومانی بەستبوو...

لەگەڵ ئەوەشدا کە دەمانزانی چی دەکەین و چی دەگوازینەوە و دەبین بە هۆکار بۆ چەندەها نەهامەتی، بەڵام لەبەر ترس و تۆقین لەوانەی

سەرو خۆمان نەماندەوێرا بچووکترین ڕەخنەمان هەبێت، لەو دنیا پیسەی ئەواندا گەوزابووین. بەتەواوی مانا کەوتبووین و نەماندەتوانی هەستینەوە.

## خەونەکانی خوێندنگەمان بەبا چوون:

ئێمە کە جاران زیرەکترین و تێکۆشەرترین خوێندکاری قوتابخانەکەمان بووین، نەمانتوانی کۆتا پۆلی ئامادەیی ببڕین. نەشمانتوانی بچینە تاقیکردنەوەی وەرگیران لە زانکۆ. لەکاتێکدا ئێمە سوێندمان بۆ خۆمان و خۆشەویستانمان خواردبوو کە هەوڵ بدەین و سەرکەوتووبین، بەڵام ڕووداوەکان هەموو جۆرە جوانی و ئومێد و باوەڕێکی یەك یەك لە ئێمە دەدزی. بەپرتاو بە ڕێیەکی نەزانراودا بەرەو کۆتاییەکی نادیار ڕامان دەکرد. زۆر بێزاربووبووین لەو کارەی دەمانکرد، وەلێ توانای بەرهەڵستیمان نەبوو. بەتایبەتی دوای ئەو خەوەی بە دایکمەوە بینیم. لە خەونمدا دایکم یەخەی گرتم و ڕاپتەکاندم و قیژاندی بەسەرمدا : "تۆ کوڕی شەهیدیت کورە. ئێمە کوژراین و خوێنمان بەناحەق ڕژا، بەڵام خوای گەورە پلەی شەهیدی پێبەخشین. کەچی تۆ چوویت خۆت گلاند لە گڵاوترین ئیشەوە. بوویت بە مایەی شەرم بۆمان". ئەم خەوە ئەوەندەی تر لە ترسناکی کارەکەمان ئاگاداری کردینەوە. بەتایبەتی ڕەسوڵ هەر زۆر دوودڵ و دڵگرانبوو.

جارێکیان بڕێکی زۆر لە ماددەی بێهۆشکەرم پێبوو و دەمبرد بۆ ناونیشانێك. بەمەبەستی سەرشێواندن لە پۆلیس، ئەو ماڵانەی ئەم جۆرە مامەڵەیەیان تێدا دەکرا بەردەوام دەگۆڕان. بۆیە ئێمەش هەرگیز دووجار

نەدەچووین بۆ شوێنێك. ناونیشانەكەمان دۆزییەوە. خزمەتكارەكە دەرگاكەی كردەوە. یان ڕاستتر بڵێین ئەو كچە كردییەوە كە ڕۆڵی خزمەتكاری دەبینی، كە لەڕاستیدا لەوانەیە یەكێك بێت لە مشتەرییە بەردەوامەكان. وتی:

– دەتوانن جانتاكە بدەن بە من.

ئێمە سەرەتا دوودڵ بووین و پرسیاری ژنەكەمان كرد. وتی:

– ئەو ئیتر لێرە نییە.

وشەی "نییە" ی ئەوەندە بە دەنگێكی غەمگین گوت كە مانای "ئەو مردووە، نەتانبیستووە؟" ی دەگەیاند. كەواتە ئەو ڕاڕەوە تاریكە یەكێكی تریشی قووتدا.

تەسلیممان كرد. ئەو جانتایەشمان هەڵگرت كە بڕیاربوو بۆ جێیەكی تری ببەین. كچەكە وتی:

– كەمێك بوەستن. گەورەم دیاریەكەتان پێشكەش دەكات.

مەبەستی لە دیاری پارەكەبوو. پێدەچوو گەورەكەشی ئەو كەسەبێت كە سەرپەرشتی ئەو كارە پیسانە دەكات. بڕیاربوو بۆ یەكەمجار بیبینین. جا ئیتر یان بە هەڕەشە و گوڕەشە ناچاری كاری مەترسیدارتر و ئاڵۆزتری دەكردین، یان بە ستایشی درۆ دەیبردین بە حەوادا و دەیكردین بە سەگی گوێڕایەڵی خۆی.

## ڕێگایەکی بێ گەڕانەوە

بردیانین بۆ ژوورێك. وەك قۆچی قوربانی چاوەڕێی قەسابەکەمان دەکرد. پاش کەمێك پیاوێکی قۆزی جوانپۆشی قژ ماش و برنجیی خۆی کرد بە ژووردا. چل و پێنج یان پەنجا ساڵ دەبوو. بەڕوونی ڕۆحێکی جانەوەری شەڕەنگێز لەژێر زەردەخەنە دەستکردەکەیەوە دەبینرا. دەستی نایە سەر شانمان و، وتی:

– کوڕینە! پێویستە ئەوە بڵێم کە زۆر بەختەوەرم بە ناسینی ئێوە، چەند مانگێکە چاوم لەسەرتانە. کاری چاکتان کرد و هیچ هەڵەیەکتان نەکرد. بۆیە خولیای ناسینی ئەم دوو گەنجە ئازایە کەوتە سەرم. وەکو دەزانن، ئێمە تەنها لەگەڵ ئەو کەسانەدا کۆدەبینەوە کە زۆر بایەخدارن بەلامانەوە. باوەڕم وایە ئەم ڕاستگۆییەتان تا سەر بەردەوام دەبێت. لە ماوەیەکی کەمدا دەگەن بە خۆشگوزەرانی و دەوڵەمەندییەکی هەمیشەیی، بەڵام شتێك هەیە کە دەمەوێت بیزانن. ئێمە کەسانێکین لەپێناو پاراستنی دۆستانمان و بەرزکردنەوەیان ئامادەین گیانمان ببەخشین. دەبێت ئەوانیش بۆ ئێمە وابن. ئەگینا بێوەفاییەکی بچووك دەتوانێت ئەم دۆستایەتییە لەناوبەرێت.

دەستی بۆ گیرفانی برد. دوو پاکەتی دەرهێنا و، وتی:

ـ ئێستا شایانی ئەوەن ڕابووێرن. بەڵام لەمەولا زوو زوو یەکتر دەبینین.

بێ ئەوەی دابنیشێت ڕۆیشت. بەڵام تۆنی دەنگی ئاگری لێ دەباری. لەڕاستیدا نە یەکترناسین و نە پیاهەڵدان بوو. هەڕەشە و چاوترساندنێکی

ناڕاستەوخۆبوو. دەیویست بڵێت: " ئیتر خۆراکی تەڵەن بە دەستمانەوە. ئێمە دەتانکەین بەو قولاپەوە کە دەمانەوێت. بۆیە ئاگاداری خۆتانبن."

چووینە دەرەوە. کچە خزمەتکارەکە پێشوازی لێکردین و، وتی:

– خواردن ئامادەیە. فەرموون با بچینە چێشتخانەکە.

تەواو بێتاقەت بووبووین. دەمانویست چی زووە دەربچین. بۆیە سووربووین لەسەر ڕۆیشتن. وتی:

– نابێت. گەورەم فەرمانی داوە.

تەنانەت خواردنیش بە فەرمان بوو. چیتر ئێمە خاوەن و بڕیاردەری ژیانی خۆمان نەبووین، بەڵکو گەورەیەک فەرمانی دەدا کە فڕی بە گەورەییەوە نەبوو.

نانمان خوارد.

## لەچەک ئاڵاوەکان

لەوەدابووین بڕۆین کە کچە خزمەتکارەکە فەرمانی گەورەکەی پێگەیاندین. وتی:

– کۆڵان و شەقامەکان پاک نین، پۆلیس دەگەڕێت. مەترسیدارە بەم شەوە بچنە دەرەوە. گەورەم وتی کە ئەمشەو لێرە بمێننەوە.

چووینە ئەو ژوورەی کە نیشانی داین. چونکە دەرگاکەمان نیوە کراوەبوو، بەئاسانی گوێمان لە دەنگی بەرزی قسەکانی ئەودیوبوو. دیسان ڕووداوێکی نائاسایی ڕوویدەدا. دەنگەکە دەگەیشتە ئێمە و دەیترساندین و

خوێنمانی دەبەست. بۆ یەکەمجار دڵنیابووین لەوەی کە کەوتووینەتە چ زەلکاوێکەوە.

دەنگێکی گڕ دەیقیڕاند:

– تۆ خوێنی خۆتت لێ زیادە سەرسەری؟ حەتمەن بەنیازیت بتۆپیت. ترسم لە مردنی تۆ نییە ها! لەسەر ئەم هەڵەیەی تۆ منیش ڕەوانەی دۆزەخ دەکەن... ئێستا بڵێ بزانم، چۆن لە کاتی خۆیدا چەکەکان ناهێنیت؟

دەنگێکی لەرزۆك و كز دەپاڕایەوە:

- جارێکی تر دووبارە نابێتەوە گەورەم. کێشەیەك دروست بوو کە پێشتر بیرمان لێنەکردبووەوە .

- واز لە درۆ بێنە و بڵێ پارەکەم خواردووە و تەواو!

دیاربوو پیاوەکە لەژێر ئەشکەنجەدابوو، بۆیە هاواری دەکرد:

ــ سوێند دەخۆم گەورەم. نەمخواردووە بەخوا! تەنها پارەکە دواکەوتووە.

- کەری کوڕی کەر! بەتەمای من بخەڵەتێنیت؟ سەدان گەمژەی وەك تۆم تۆپاندووە، تۆش دەبیت بە یەکێك لەوان و تەواو.

دیسان هاوارێك کە گوێی مرۆڤی کاس دەکرد. دیسان پاڕانەوە و لالانەوەی بەکوڵ. بەڵام وا دیاربوو خاوەنی ئەو دەنگە دڵی لە تۆزقاڵێك بەزەیی بێبەشە و بە هیچ ڕازی نابێت. تا هێزی تیابوو دەیقیڕاند:

ـ بڕوانە خوێڕی! بەپەلە داوای چەك دەکەن لە من. تۆ بەڵێنت دا چەکەکان دابین بکەیت و پێشەکی پارەکەیشت وەرگرت. نازانیت ئەگەر لەسەر قسەی خۆمان نەبین هەر بەو چەکانە وەکو سەگ دەمانتۆپێنن؟!

پیاوەکەی تر بە دەنگی نووساو و ماندووەوە داوای بەزەییەکی نەبووی دەکرد:

ـ بەقوربانت بم، تۆکەرتم! ئاخر من چەکی سوپایەك لە هەفتەیەکدا چۆن دابین بکەم؟

ـ تۆ بتەوێت لە ڕۆژێکدا جێبەجێی دەکەیت. پارەکەت کەمە وا باری چەکەکان دوادەخەیت؟ بەشەکەت هەر ئەوەیە، یەك فلسی ترت نادەمێ.

ـ کێ بەو پارەیە ئەو هەموو چەکە دەدات؟

ـ کورە کوڕی کەر.. نازانم چەند ساڵە من چەك لە تۆ دەکڕم. ئەم قسەیەم بە دۆستەکانت بڵێ: ئێمە بمانەوێت چەك لە شوێنی تریش دەکڕین. ئا لەم کاتەدا کە دنیا بووە بە ئاگر و هەموو لایەك لەیەکتر بەربوون، یانی چی ناردنی چەك دەبڕن؟ دەبێت چەك زۆر دابین بکەین، تا پێکدادان زۆربێت، خوێن بڕژێت، خەڵك بمرێت، ئێمەش ئەوەندەی تر بازاڕمان گەرم بێت. چی لەوە باشتر دەبێت؟ تۆش بەم بێعەقڵییەت مشتەرییەکانمان لێدەتەکێنیتەوە و دەچن لە شوێنانی تر دەیکڕن. لەم کاتەدا کە پەیوەندیمان لەگەڵ هەموو لایەنەکان باش کردووە و ئامادەن بیکڕن، تۆ دەچیت خاو و خلیچکی دەکەیت.

چیتر توانای بەرگەگرتنمان نەبوو. پەنجەمان ئاخنییە گوێمان تا دەنگی هات و هاوار و ئەشکەنجەدان نەبیستین .

یاری وەها؟!

من و پنار بە وریاییەوە گوێمان بۆ ئەو چیرۆکە سەرسوڕهێنە گرتبوو. لەدڵی خۆماندا دەمانوت: ئای خوایە! توانەوە، سڕبووبووین بیرمان بۆ نەدەکرایەوە. ئای لەم دەورو یارییە بێ بەزەییانە! ئای لەو پلانە چەپەڵانە... بۆ پارە چەندەها کەس دەبنە قوربانی؟

ئای لەو بێویژدانانەی بۆ پارە باوەش بۆ چەك دەکەنەوە، ئای! ئاخۆ ئێوە بۆ وا دەکەن؟ جا بۆ ئەو پارەیەی بۆتە خوێن و گیانتان خۆتان بە گیرفانی کێدا ناکەن؟

لەو جەنگی دژەتیرۆرەی لە وڵاتەکەماندا هەبوو ئەوانەی دڵخۆش دەبوون دەوڵەمەندەکان بوون و ئەوانەش کە دەکوژران و دەمردن و دەگریان و ژیانیان لەناودەچوو ئێمەبووین. لەبەرامبەر ئەم یارییەی ئێمەی بەردەدایە گیانی یەکترو وڵاتەکەی پارچەپارچە دەکرد، هەرلەویادا لەگەڵ ڕەسووڵ بڕیارماندا:

- ئەگەر دەشمرین با بمرین بەڵام ئیدی درێژە بەم کارە نادەین.

کتوپڕ هەنسك کێشان و فرمێسك ڕشتنی پنار گفتوگۆکەی بڕی.

## لەو ساتەدا کە وتمان با ڕزگارمان بێت

هەرچەندە کاک ڕەسوڵ و کاک ئەحمەد و مەدینەخان سەریان لەوە سووڕما، وەلێ من بەلامەوە ئاسایی بوو. ئەو کارەساتەی وەکو ئاگر ناخی پناری دەسوتاند، هێشتا وەك دوێنێ لە یادمە:

لەگەڵ پناردا نوقمی پیسێتیو کاری چەپەڵ بووبووین. مرۆڤگەلی ستەمکار و بێبەزەیی دنیای تاریکی ئێمەیان گەیاندە جێیەك کە ڕێی گەڕانەوەی نەبوو. لەگەڵ پنار بیرمان کردەوە و بڕیارمان دا: لەپێناو پاراستنی شەرەف و کەسێتی و مرۆڤێتیمان و، بۆ ئەوەی وەك مرۆڤێك بەڕووی سپی و سەری بەرزەوە بژین، پێویستە چی زووە واز لەو کار و مرۆڤانە بێنین و هەڵبێین .

بەڵێ، بڕیارمان دا. بڕیارێکی بوێرانە و دلێرانە. ئەی ئەنجام؟ ئەنجامەکەی ترسناك بوو. نازانم چۆن هەواڵیان پێگەیشت و زانییان. ئومێد و هیوای ئێمە ئەو ڕۆژە وشکی کرد. ئیتر ئێمە دوو تەرمی زیندووبووین کە ڕۆح و سەربەرزیی خۆمان دۆڕاندبوو. دوای ئەو ڕووداوە وەکو ڕۆبۆت یان مەکینەیەك بۆ کوێیان بویستایە ڕایان دەکێشاین. مەگەر چاوەڕێی چی تر دەکرێت لە یەکێك کە بەها باڵاکان و هەستە بەرزەکانی لە دەست دابێت؟

پنار چەند خەون و خەیاڵی جوانی هەبوو! ئیشێکی شەرەفمەندانەمان دەدۆزییەوە و هاوسەرگیریمان دەکرد. دەگەیشتین بەو بەختەوەرییەی کە هەموو ڕۆژێك لە خەیاڵماندا ئارایشتمان دەدا. وەلێ هەموو ئەمانە لە

شەوێکدا تەواوبوون. ئەو ئاگرەی کە ئێستاش دەمقرچێنێت هەر هی ئەو کاتەیە. هەرچیەکیش بکەم هەر لەگەڵمدایە. تەنانەت بۆ کەمکردنەوەی ئەو ئازارە و خامۆشکردنی ئەو ئاگرە هەوڵی خۆکوشتنمان دا، بەڵام ئەویش چارەیەك نەبوو. هەنسك و ناڵەی پنار لەبەر ئەمەبوو.

گریان و فرمێسکی بەخوڕی پنار چاوی هەموانی تەڕکرد. مەدینەخان وەك دایکێکی بەڕەحم باوەشی کرد پێیدا و، ماچی کرد و، دڵی دایەوە. لەوانەیە پنار دوای ساڵانێکی دوور و درێژ ئەوە یەکەمجاری بووبێت هەست بە خۆشەویستی و دڵسۆزیی ڕاستەقینە بکات.

کاك ئەحمەد دڵی پڕبووبوو، نەیتوانی بەردەوام بێت. کاك ڕەسوڵ لەو شوێنەوە دەستی پێکرد. دەتووت سەرگوزەشتەی ژیانی ئێمە دەگێڕێتەوە نەك هی خۆیان:

– ئەو ڕۆژە بۆ ئێمە بوو بە خاڵی وەرچەرخان. بەتایبەتی کاتێك زانیمان هەمان ئەو گروپە مافیایەی ئێمە تێیداین چەك بۆ هەموو لایەنەکان دابین دەکات و چی لە دەست بێت درێغی ناکات بۆ خۆشکردنی ئاگری دووبەرەکی و جەنگ و، بەرپرسیارە لە مردنی هەزاران بێتاوان و کاولبوونی وڵاتێك. ئیتر نەمانتوانی هەنگاوێك زیاتر بنێین. کەوایە هیچ نەبێت دەبوو خۆمان لەو چەتە خوێنڕێژانە دووربخەینەوە و ڕوومان بێت بڵێین چاکەیەکمان کردووە لە ژیانماندا. بەتایبەتی کاك ئەحمەد زۆر خولیای ئەمە بوو. چونکە ئەوانەی خێزانەکەی ئەویان ستەمکارانە کوشتبوو دوور و نزیك پەیوەندییان بە گروپەکەی ئێمەوە هەبوو.

باشه، بەڵام ئێستا دەبێت ئێمە چی بکەین؟

ئاسایی یەکەم شت کە هات بە خەیاڵماندا پۆلیس بوو. ئێمەی نەزان و کەمئەزموون ڕۆژێکیان بە خۆمان و جانتای پڕ لە ماددەی هۆشبەرەوە خۆمان گەیاندە نزیکترین بنکەی پۆلیس. نەهامەتییەکانمان لەوێوە دەستی پێکرد. تومەز چاودێرییان کردووین. بۆ سبەینێ گرتیانین. چاویان بەستینەوە و لەدوای گەڵابەیەکیان هاویشتین. جەللادێکی بێبەزەیی و خوانەناس و بێویژدانیش بەزۆر سەرمانەوە قوت کرابووەوە. بە تێلاکەی دەستی شوێنێك نەما لە جەستەماندا نەیشکێنێت و خوێنی لێنەهێنێت و نەیئاوسێنێت. کابرا ڕێك بۆ کوشتن تێی دەسرەواندین نەك بۆ چاوترساندن. پێدەچوو ماندوو بووبێت، بۆیە جلەکانی بەری داکەندین. پاشان بە چەقۆکەی هەموو گیانی ڕووشاندین. بەجۆرێك پشتمان شەقار شەقار بووبوو.

ئەمە چۆن ئەشکەنجەیەك بوو؟ چ مرۆڤایەتییەك بوو؟ چ وەحشیگەرییەك بوو؟ لەوانەیە نە سەربڕەکانی ستالینی کۆمیونیست و نە پیاوە فاشیستەکانی هیتلەر ستەمی وایان نەکردبێت.

هەستم کرد ئەحمەد دەنگی نەما. منیش بەرچاوم ڕەش داهات و دڵم هات بەیەکدا. چیتر نەمدەتوانی هەناسە بدەم. هێواش هێواش بەرەو مەرگ ڕێمان دەکرد.

# بەشی سێیەم



## ئەو ڕۆژانەی بەرگەگرتنیان ئەستەم بوو

من و پنار لەم ڕووداوە جەرگبڕترمان بەسەرهاتبوو.

پناریان ناچارکرد بە کردنی کارێکی ناشرین کە هەرگیز پێی خۆش نەبوو. هەردووکمان بەتوندی ڕەتمان کردەوە. ئەو کەسەش کە دەیویست ئەو کارە بکات بەحساب گەورەمان بوو و سەرپەرشتی فرۆشتنی ماددە هۆشبەرەکانی دەکرد.

هەردووکمانی برد بۆ ژێرزەمینێک. دەستی بەستینەوە و ڕووت و قووتی کردینەوە. سەهۆڵاوی پێدا دەکردین و چەندەها سەعات بە پەلەقاژە و پاڕانەوەمان پێکەنی. پنار دەیقیژاند و زایەڵەی دەنگی ئاگری لە هەناوی مرۆڤ بەردەدا:

"بمکوژن، چیتر نامەوێت بژیم" !

بەڵام بەزەییان لەکوێ بوو تا ئەو سەدایە ببیستن؟ سەرما و ئازاری ئەو ڕۆژە بوون بە هۆی سستبوونی گورچیلەکانی پنار.

ئەو ژەهرەیان بە ئێمە دروست دەکرد و بە ئێمەیان دەفرۆشت و ئێمەشیان ژەهراوی دەکرد. کەچی پارەکە خۆیان دەیانخوارد و ڕایاندەبوارد. هەر کاتێك ئەو ڕووداوەم بیردەکەوێتەوە وەك پشکۆیەك دادەگیرسێم. هۆکاری پشت هەڵکردنمان لە ژیان ئەوەبوو نەماندەویست جارێکی تر ڕووبەڕووی ئەو پیسی و نەگبەتییە ببینەوە.

کاك ڕەسوڵ لەسەر گێڕانەوەی چیرۆکەکەیان بەردەوام بوو:

ـ ئیتر لەو حاڵەدا هیچ هیوایەکمان نەمابوو و چاوەڕێی مردنمان دەکرد. بەڵام لەناکاو ئوتومبێلەکە بەتوندی لەرزی، لە پشتی سەرگیراوی گەلابەکەدا بەملاو بەولادا کەوتین و تەقلەمان دەدا. نازانم ئوتومبێلەکە چەند جار وەرگەڕا و ئەمدیو دیوی کرد. کاتێك هاتمەوە هۆش خۆم پۆلیسەکان دەست و چاویان دەکردینەوە. کە ئێمەیان بەو حاڵەوە بینی زۆر سەرسام بوون .

تومەز پۆلیس ویستوویەتی سەیارەکە ڕابگرێت، بەڵام ئەمان بەنیازبوون نەوەستن و بەخێرایی هەڵبێن. هەر بۆیە لەو خێراییەدا وەرگەڕاوە. تۆ سەیری کاری جوانی خوای گەورە بکەن، ئێمە بۆ کوژران برابووین کەچی ڕزگارمان بوو. کابرای فەلاقەکار و شۆفێرەکەش هەر لەوێدا گیانیان لە دەست داوە .

چارەسەری نەخۆشخانە زۆری خایاند. تەنانەت ئەو پزیشکانەی سەرەتا هاتن بەدەممانەوە زۆر سەریان سووڕمابوو لەوەی چۆن ماوین. پزیشکێك یارمەتی داین و دەستی گرتین کە سەرلەبەری تەمەنمان قەرزاری

ئەوین. لە سایەی ئەودا ڕزگارمان بوو و ژیانێکی نوێمان پێکەوە نا. ئەو کەسە بوو بە باوکی ماددی و مەعنەویمان .

## ئەو مرۆڤە فیداکارانەی دەستگیرۆییان کردین

بۆئەوەی جارێکی تر نەکەوینە دەست ئەو پیاوخراپانە، بە یارمەتی پۆلیس ناسنامەمان گۆڕی و پاشان لە شارێکی تردا بە کۆمەکی دکتۆر مستەفا دەستمان کرد بە خوێندن. دوای ئەو وانە فەرامۆش نەکراوانەی ژیان پێی داین، بە هەموو هێزمان باوەشمان کرد بە خوێندندا. لەگەڵ ئەحمەددا لەپاڵ خوێندندا بۆیاخچێتی و دەستگێڕیشمان دەکرد. لە هەمووی گرنگتر دکتۆر مستەفا بە وانە بەپێزە ئیمانییەکانی دنیای ڕۆحمانی ڕووناک کردەوە و ژیانی مەعنەویمانی بووژاندەوە. بەمەش دەرگای جیهانێکی ئاسوودە و ئارامی بۆ کردینەوە. ئەوکات باشتر تێدەگەیشتین لەوەی کێین و، بۆچی دەژین و، چ هەڵەیەکمان کردووە و، پێویستە چ چاکەیەك بکەین .

ئەو کەسەی کاك ڕەسوڵ و کاك ئەحمەدی ڕزگارکردووە پزیشکێکی ئیمانداربووە. ئەوەی ئێمەشی ڕزگارکرد هەر پزیشك بوو. ئەویش لە باشیدا کەموێنەیە. دەڵێیت ئەم چیرۆکانە دوو بەشی یەك ژیانن... وەك بڵێیت ڕێبوارانی هەمان ڕێ لە شوێنێکدا کۆبوونەتەوە. بەڕاستی حاڵەتێك بوو ئەگەر بیری لێبکرایەتەوە نهێنی و پەیامی زۆری تێدابوو .

بەڵام من و پنار توانای ئەم جۆرە ڕاڤەکردنانەمان نەبوو. سەرەتایەکی نوێ و ژیانێکی تازە.. بەخۆداچوونەوە و سەرلەنوێ

بنیاتنانەوە.. ئەمانە زۆر زۆر گران بوون بۆ ئێمە. نە بیر و نە ڕۆح و نە باری دەروونیمان ئامادەنەبوو بۆ ئەمە. زۆرم حەزدەکرد سەرەڕای هەموو ئەو خراپانەی تووشی بووین سەرەتایەکی نوێ بەرپابکەین و، ئەو کارەساتانەی ڕوویاندا بە نەبوو ئەژماریان بکەین و، خۆمان بۆ ژینێکی دوور لە تاوان تەرخان بکەین، وەلێ ئەوە مەحاڵ بوو. ئەمە وەك ئەوە وابوو درەختێکی وشك ژیانی بەبەربێتەوە و مردوو زیندووببێتەوە. چۆن خوا یارمەتی دوو کەسی دەدا کە ژیانیان تەنها لە سەرپێچیدا بردبێتە سەر؟

ئەگەر وایە ئەم ڕووداوە ڕازئامێزانە مانایان چییە؟ دوای ئەو کارەساتانە ئەم دیارییە جوانانە چییە پێشکەشمان دەکرێت؟ هۆکاری ڕووبەڕووبوونەوەمان لەگەڵ ئەم مرۆڤە پاکانەدا چییە؟

نەمدەتوانی لەم جەنگی بیرکردنەوەیە دەربازبیم. حەتمەن پناریش دەبێت وابێت، چونکە ئاگام لێبوو زوو زوو خەیاڵ دەیبردەوە. بلێی ئەمە ڕێیەکی تازە بێت؟ یاخود بەهارێکی کاتییە لەناوەڕاستی زستانێکی سەختدا و، تەنها هەناسەیەکی کورتی ئاسوودەییە؟

لەکۆتایی ئەو گفتوگۆ شیرین و بەنرخەدا کاك ئەحمەد داوای مۆڵەتی ڕۆیشتنی کرد. دڵی داینەوە و، وتی:

– پشت بەخوا زوو زوو یەکتر دەبینین.

بەلام کاك ڕەسوڵ و مەدینەخان کە چەند مانگێك بوو جێیان نەهێشتبووین، لامان مانەوە.

## لە نەخۆشخانە دەردەکراین

لەکۆتاییدا دەردەسەری نەخۆشخانە بە پایان گەیشت. پزیشک وتی:

– دەی کەفارەتتان بێت! ئیتر لە من ساغترن. ئەمڕۆ دەرتان دەکەین. هیچ نەبێت لەمەودوا ئاگاتان لە خۆتان بێت. خوای گەورە بە موعجیزەیەك ڕزگاری کردن و ژیانی پێبەخشین. کاتێك هێنران بۆ ئێرە هەموومان دەستمان لێ شتبوون. با بزانن هەموو کاتێك خوا هەلی وا بە بەندەکانی نادات. پێویستە باش لە حیکمەتی ئەمە تێبگەن و ئەم تەلیسمە شیکاربکەن. ئەوەی لەسەر شانی ئێمەبوو کردمان و ئێوەش بە بۆچوونەکانی خۆتاندا سەبارەت بە ژیان بچنەوە و، هەوڵ بدەن پەند و ئامۆژگاری لە ڕووداوەکان وەربگرن. ئەگینا مردن هەموو کاتێك دەست مرۆڤ ناکەوێت. چونکە مردنیش چاکە و جوانییە. چونکە تەنها خوا" گیان دەبەخشێت و، خواش وەریدەگرێت. لەبیرتان نەچێت خۆکوژی کۆتایی ژیانێك نییە، بەڵکو سەرەتای نەهامەتییە.

پزیشکەکە ڕاستی دەوت. بەئاشکرا دیاربوو دەستێکی نادیار ئێمەی گەڕاندەوە بۆ ژیان. پێویستبوو ئەم ڕووداوە ورد و پڕ لە پەندە بە دروستی هەڵبسەنگێنین. بەڵام بە چ ژیری و داوەرییەك ئەوەمان بکردایە؟ ڕابردووی نەفرەتی ئیرادەی بۆ نەهێشتبووینەوە!

گەیشتین بە لەشساغی و لە نەخۆشخانە ڕوخسەتیان دەداین. تا ئێرە هەموو شتێك باش بوو، وەلێ ئەی لەمەودوا؟ دەچووین بۆ کوێ و لە کوێ دەماینەوە؟ لەلایەك پۆلیس و لەلایەك مافیا و خوێنڕێژان... باشە ئەم

چوونە دەرەوەیە چوون بەرەو مەرگ نەبوو؟ کەوایە لەشساغی و دەرچوون لە نەخۆشخانە سەربەستی نییە، بەڵکو بەردەوامیی مەینەتییەکانە. خۆزگە چارەسەرمان تەمەنێکی دەخایاند و بۆ خۆمان بێرەی لەوێ جێمان دەبوویەوە !

پنار و کاک ڕەسوڵ و مەدینەخان لە ژوورەکەی مندا بوون. پێکەوە سەیری هەواڵەکانی بەیانیمان دەکرد. کاتێک باس لە دەرچوونی پرۆژەیاسای لێبووردنی گشتی کرا لە پەرلەماندا، کاک ڕەسوڵ بە خۆشحاڵییەوە ئاوڕی بۆ داینەوە و، وتی:

- دەی چاوتان ڕوون، ئیتر پۆلیس بەشوێنتاندا ناگەڕێت.

کەواتە کاک ڕەسوڵ دەیزانی! ! تەنها زانیارییەکی سەرپێییمان لەسەر ڕابردوومان پێدابوو. بەڵام ئەو دەیزانی تووشی چ تاوانێك هاتووین و، چۆن لە کاری پیسەوە گلاوین و، بۆچی هەوڵی خۆکوژیمان داوە، یاخود لەوانەیە تەنها پێشبینی کردبێت.

ئەمە هەواڵێکی خۆش بوو یان ناخۆش؟ دەبوو دڵمان خۆش بێت یان تەنگ؟ ڕزگاربوون لەوەی پۆلیس بمانگرێت، سەربەستییە یان سەرەتای کۆتاییە تاڵەکەمانە؟ واتە ئەم لێبووردنە گشتییە ڕاستەوخۆ پاڵمان پێوە نانێت بۆ لای دوژمنە دڵ پڕ لەقینەکانمان؟ هیچ نەبێت ئەگەر پۆلیس بیگرتینایە لە بەندینخانەدا گیانمان لە مەترسیدا نەدەبوو. ئەی ئێستا؟ بەتەواوەتی بێچارەبووین .

دەستمان کرد بە خۆپێچانەوە. یەك یەك خواحافیزیمان کرد لەو پزیشك و پەرستار و کارگوزار و پۆلیسانەی کە لەو ماوەی هەشت مانگەدا وەکو یەك خێزانمان لێهاتبوو. چاوان تەڕبوون و دڵان تەنگ. تەنانەت ئێمەش گۆڕابووین چونکە دەمانتوانی بگرین و خەمبارببین. لەحاڵێکدا دەمێکبوو ئێمە وەك ڕۆبۆت دەژیاین و ئەو شتانەمان لەبیرچووبووەوە. کەواتە هەشت مانگی بەئازاری نەخۆشخانە ئەو هەستە کۆن و تۆزلەسەرنیشتووانەی تێدا ژیاندینەوە. ئەمە هێمایەکی باش بوو یان خراپ؟ بێگومان خراپ... چونکە ژیانێکی بێڕۆح و دوور لە بیرکردنەوە کەمتر ئازاری دەداین، وەلێ هەنووکە هەموو ڕووداوێکی ناخۆش برینەکانمانی دەکولاندەوە و هەست و سۆزمانی بریندار دەکرد.

## ڕزگاربوون، یاخود سەرەتای نەهامەتی؟

خۆمان ئامادەکردبوو، بەلام جلێك نەبوو بیپۆشین. ئەو تیشێرتە سادانەی لە کاتی کارەساتەکەدا لەبەرماندابوون ونجڕ ونجڕ بووبوون. تەنها ئەو جلی خەوەمان هەبوو کە کاك ڕەسوڵ و مەدینەخان بۆیان هێنابووین. لەگەڵ پناردا نەماندەزانی چی بکەین و سەرمان سووڕمابوو. ئەوەندەمان زانی کاك ڕەسوڵ و مەدینەخان خۆیان کرد بە ژووردا، بە خۆیان و زەردەخەنەی سەرلێویان کە قەت کەمی نەدەکرد و پاکەتەکانی دەستیان... وتیان:

- ئەمانەمان بۆ ئێوە کڕیوە. ئیشەڵا بە بەرتان دەبێت.

لەگەڵ پنار سەیری یەکمان کرد. ئەوەی ڕاستی بێت ئەو دیمەنە زۆر کاری لێکردین.

چاکەکاری..!

ئەو چاکەیەی کە لەبیرمان چووبووەوە و ناویشیمان لەیادکردبوو!

کاتێك لەگەڵ پنار جلەکانمان تاقیدەکردەوە، بەزۆر خۆمان گرتبوو نەگرین. جلوبەرگی نایاب و گرانبەهابوون .

هەرچەندە نەماندەتوانی قسەی دڵمان بەیەکتر بڵێین، وەلێ من و پنار بیرمان لە هەمان شت دەکردەوە: " بڵێی ناوەوەشمان وەکو دەرەوەمان ئاوا تازە و پاك ببێتەوە ؟"

وەك ئەوەی یەکەمجارم بێت بینیبێتم، بەسەرسامییەوە کەوتمە ڕوانین لە پنار. کچێك بە قاچێکی دەستکرد و، جەستەیەکی ماندوو و لاواز و، ڕوخسارێکی ڕووناکەوە. هەرچەندە زۆربەی هەستە مرۆییەکانمان لەدەستدابوو، بەڵام پەڕینی قاچێکی ئەو، هەمیشە وەك تیرێکی ژەهراوی لە دڵمدابوو. لە دڵی خۆمدا دەمووت خۆزگە هی من بقرتایە ! چونکە ئەو بەو هەموو جوانی و باشییەوە شایانی ئەوە نەبوو. تاوانباری سەرەکی من بووم و دەبوو من سزابدرێم.

بەتایبەتی کاتێك پنار بە ڕوانینێکی شیرین سەیری جلەکانی کردم و زەردەخەنە گرتی، ئەو ڕۆژەم بیرکەوتەوە کە یەکمان ناسی. بە خۆمم وت: "دەبێت ئەو ڕۆژە بە حەسرەتەوە یان بە نەفرەتەوە یادبکەینەوە؟ دەبێت

بلێین خۆزگە یەکمان نەناسیبا، یان بەس نەبوو یەکترمان دۆزییەوە؟ ".
بەڵام هەرچۆنێك بێت، ساتێکە کە هەرگیز لەبیرم ناچێت.

ژیانە پڕدەردەسەرییەکەم
بە خەیاڵ گەڕامەوە بۆ ئەو ڕۆژە...
مەگەر خوا بزانێت چەندجار بیرم لەو دیمەنە کردووەتەوە!

باوکم زۆر دەوڵەمەندبوو. بۆیە زۆر سەرەڕۆ و نابەرپرسانە گەورەبووم. لەسەر هیچ شتێك لێم نەدەپرسرایەوە و چیم بویستایە لە دەستمدابوو. بارودۆخی خێزانەکەشمان تابڵێی شڵەژاوبوو. کە پارە لە گیرفانماندا زۆربوو کەس نەیدەزانی کێ خەریکی چییە. ڕاهاتبووین بەو قسە و قسەڵۆکانەی دەربارەی باوکم دەکران. وردە وردە ناوی منیش تێوە دەگلا لەو جۆرە بەیت و باڵۆرانەی دانیشتوانی گەڕەکەوە. وەلێ چەند قسەیەك سەبارەت بە خوشکە گەورەکەم پشێوی لە ماڵماندا نایەوە. لەسەر ئەوە (سەودا) ی خوشکم ماڵی جێهێشت. بەڵام بەداخەوە پاش ماوەیەك بە خەڵەتێنراوی و بەجێهێڵراوی گەڕایەوە. دیسان باوك و دایکم باوەشیان بۆ کردەوە. وەلێ خوشکم بەرگەی نەگرت و کۆتایی بە ژیانی خۆی هێنا.

بیری خۆکوژی لەو کاتەوە وەك بزمارێك لە مێشکم چەقی و جێگیربوو. خۆکوشتن بەلای کەسانی باوەڕ لاوازەوە ڕێگای ڕزگاربوون بوو لە کاتی تەنگانەدا، ئەمە لە مێشك و خەیاڵمدا ڕەگی داکوتا و مایەوە.

# بەشی چوارەم



## جوانی خۆرهەڵاتیشم سوتاند

بەڵێ، لەو ڕۆژەدا پنارم ناسی. کچێکی باڵابەرزی ئەسمەری چاوجوان بوو. بە شەوقەوە هاتبوو بۆ خوێندن. کەسێکی زۆر شەرمن و بەڕەوشت بوو. ئەوەندە بەڕێز و بەحەیابوو، ئێستاش لەعنەت لە خۆم و ئەوانە دەکەم کە بوون بە هۆکاری ئەو هەموو بەڵا و نەگبەتییەی بەسەر ئەو کچە داماوەدا هات. هەرچەند ئەو چەندەها جار وتوویەتی " تۆ تاوانبار نیت، من تۆم بەخشیوە "، بەڵام من ناتوانم لەخۆم ببوورم و تا ماوم ئازاری ویژدانم سزام دەدات.

پنار ئەوەندە ڕاستگۆ و پابەند بوو بە بەڵێن و پەیمان و خۆشەویستییەکەیەوە، گەر هەزارانی وەك من کۆبکرێنەوە هێشتا هەر پێی ناگەنەوە .

چـۆن لـەبیرم دەچـێتەوە ئـەو یەکـەم ڕۆژە؟! هـەر لـەو ڕۆژەوە پـەیمانێکی دا و لـەپێناو نەشکاندنی بەڵێنەکەیدا هـیچ فیداکارییـەك نـەما نەیکات .

ئەو ڕۆژە چووم بۆ زانکۆ. بـۆ ئـەو کۆلێجـەی کـە چـەندەها سـاڵ بـوو تێیـدا دەمامـەوە و دەرنەدەچـووم. مەبەسـتم خوێنـدن نـەبوو، بـەڵکو لـە بیانوویـەك دەگـەڕام سـەری قسـە لەگـەڵ گـەنجان بکەمـەوە و مشـتەری بدۆزمەوە بۆ فرۆشتنی مادده هۆشبەرەکان. هەر ئەوەنـدەی کەوتیتـە نـاو ئەو دنیا پیسەوە، ئیتر چەند نـاڕازی بیـت لـەو کـارەی دەیکـەیت و چـەند ویژدانت ئازارت بدات، چارەیەکی تـرت نییـە. یـان دەبێـت ڕۆژانـە گـەنجی تـازە بدۆزیتـەوە و ژەهراوییـان بکـەیت، یـان خـۆت ژەهـراوی دەکرێـت و ڕووبەڕووی کۆتاییەکی ترسناك دەبیتەوە. چ ڕاستییەکی تاڵ بوو ئەوە. من کەسێك بووم بۆ ئەوەی نەکوژرێم کەسانی ترم دەکوشت.

ئەو ڕۆژە چەند کارێکی سـەرپێییم ئەنجامـدا و چـەند گـەنجێکی نـوێم کرد بە هاوڕێم. قەرەباڵغییەکم بینی بـەرەو ژێرزەمینـی کـۆلێج دەڕۆیشـت، بەوەدا تێگەیشتم کە ڕۆژی هەینییە.

کە ئەو خوێندکارانەم بینی لە دڵی خۆمدا وتم: " سەرەڕای ئەو هەموو هەوڵ و کۆششەی دەدرێت بۆ ژەهراوی کردنـی گـەنجان و تێکـدانی وڵات و ڕووخانـدنی ڕەوشـتی لاوان، کەچـی هێشـتا کەسـانێك هـەن کـە چـاکن و تەقـەلای چـاکە دەدەن. " هەرچـەندە دوور و نزیـك پەیوەنـدیم بـە خـوا و

ئیمان و بەندایەتییەوە نەبوو، وەلێ نەمدەتوانی بە چاوی سەرسوورمانەوە بۆ ئەو کۆمەڵە گەنجە نەڕوانم و ئیرەییان پێ نەبەم.

کتوپڕ جووڵەیەك لە ناخمدا بەرپابوو سەبارەت بە دوعا و نوێژ و ئەو مزگەوتەی کە جەژنە و جەژن سەرێکم لێدەدا. بێئەوەی بیر لەوە بکەمەوە کە چەند تاوانبارم و، تەنانەت لەوەی کە پاك و گونجاو نیم بۆ نوێژ، تێکەڵی کۆمەڵەکەبووم. لەئاکامدا خۆم لە مزگەوتە بچووکە قەرەباڵغەکەدا دیتەوە. لەوانەیە ئەوە زیندووبوونەوە و هاواری کتوپڕی ئەو خووەی جاران بێت کە جاروبار بەشداری نوێژی هەینیم دەکرد.

## تۆ سەیری کاری خوا بکە

ئەو نوێژە نوێژێکی تەواو جیاوازبوو. چونکە یەکەم نوێژبوو بە شەرم و تەریقی و سوورهەڵگەڕانەوە کردبێتم. کاتێك لەو کەشە ڕۆحییەدا مەست بووبووم، لەناکاو بیرم کردەوە لەوەی من چی دەکەم لەنێو ئەم مرۆڤە پاك و دروستانەدا؟ نەك تەنها بیرکردنەوە، بەڵکو لەپڕێکدا شڵەژام و پەشۆکام، تەنانەت ترساشم. خێرا خۆم گەیاندە ڕیزی دوای دواوە و ویستم لەو دووڕوویی و شەرمە قوتاربیم. تا نوێژەکە تەواوبوو جێم بەخۆم نەدەگرت. ئەوەندە سەرم گێژی خوارد دەتووت یەکێك دەستی ناوەتە بینم و، قورسییەکی زۆر لەسەر دڵمە. هەر کە نوێژ تەواوبوو بەپەلە خۆم گەیاندە دەرەوە. هەستم کرد شتێکی شلەتێن لە لووتمەوە دێتە خوار. دەمارەکانم چیتر بەرگەی ئەو پەستان و تۆفانەیان نەگرت و خوێنێکی زۆر لە لووتم

دەهات. لەسەر کورسییەك لە بەردەم دەرگای مزگەوتەکەدا دانیشتم. چونکە پەڕۆیەکم پێنەبوو هەموو گیانم بووبوو بە خوێن.

پاش تۆزێك گروپێك خانم لە مزگەوتی کچان هاتنە دەرەوە و بەلامدا تێپەڕین. کاتێك منیان لەو حاڵەدا بینی ویستیان یارمەتیم بدەن. یەکێکیان دەستەسڕێکی دامێ و، وتی:

ـ فەرموو برا. هەوا گەرمە، لەوانەیە هی ئەوەبێت...

لەو کاتەدا چاومان چووە سەر چاوی یەك. ئەوە چ جوانییەك بوو خوایە گیان! بەجارێك هەموو بوونمی لەرزاند و سەرلەبەری بۆچوونەکانمی سەبارەت بە خۆشویستن گۆڕی.

یەکەم عەشقم

جوانی و ڕەوشت و هەڵسوکەوتی دڵمی پێکا. بەتایبەتی لە جلە پۆشتەکەیدا دەتووت فریشتەیەکە و دابەزیوەتە سەر زەوی .

لەو کاتەدا کە پشتی هەڵکرد و ویستی بڕوات، نەمتوانی بەر بە هەستەکانم بگرم و، وتم:

ـ زۆر سوپاس خانمی بەڕێز! هەرچەند ناویشت نازانم، بەڵام ئەزێتت کێشا. حەزدەکەم ئەو کچە بناسم کە ئەم چاکەیەی لەگەڵ کردم .

بەشەرمەوە بەحاڵ زەردەخەنە گرتی و، وتی:

ـ هیچم نەکردووە. تەنها پارچەیەك دەستەسڕم پێداویت. هەرکەسێکی تر بووایە ئەوەی دەکرد.

دەستم درێژکرد و خۆم ناساند:

- من قوتابی ئەم کۆلێجەم. لە قۆناغی سێم، ناوم ئومێدە .

بەڵام دەستم بە بۆشی لە هەوادا مایەوە. دڵم گەردی نەگرت لە ڕەفتاری ئەو کچە بالآپۆشەی کە تازە لە مزگەوت هاتووەتە دەر. بەپێچەوانەوە زۆرم پێ خۆشبوو. لە بەرامبەرمدا کچێك ڕاوەستابوو کە ناشرینییەکانی شارێکی گەورە پیسی نەکردبوو.

تکام لێ کرد:

- ناتەوێت ناوت بڵێیت، لەوە تێگەیشتم. ئەی چۆن بتدۆزمەوە؟ هیچ نەبێت ئەوە بڵێ!

زۆر بە شەرم و بێتاقەتییەوە وتی:

- پێویست بەوە ناکات.

لێی پاڕامەوە:

- تکایە، بۆ خاتری خوا، با ئەم ڕووبەڕووبوونەوە جوانە لێرەدا تەواو نەبێت. زۆرم پێویست بە کەسێکی پاکی وەك تۆ هەیە. پێویستە ئەم ڕووداوە مانایەکی هەبێت. گەر تۆش نەیەیت من سبەی بەیانی تا ئێوارە لێرەدا دەوەستم.

ڕۆیشت...

نازانم گوێی لێبوو یان نا، وەڵامەکەی بەڵێ یە یان نەخێر. تەنها یەك شتم دەزانی: لە هەموو ئەو کچانە جیاوازبوو کە تا ئێستا لە ژیانمدا ناسیبوومن. هەر بەڕاستی ویستم بیناسم و مەبەستێکی خراپم نەبوو.

چەندەها جار ئەوانەی سەرو خۆمان ئاگاداریان کردبووینەوە:

"کەوتنــە داوی کچــانەوە قەدەغەیــە. کاروبــاری دڵ بــازاڕی ئێمــە تێکدەدات. قەیناکــە لــە مشــتەری دۆزینــەوە و گواســتنەوەی ماددەکــەدا بەکاریان بهێنن. ئەگینا بەپێچەوانەوە خاوتان دەکەنەوە و دەبن بە لەمپەڕ لــە ڕێتانــدا. لــە هەمووشــی خــراپتر ئەگــەر بــزانن خــەریکی چ کــارێکن زوو ئاشکرا دەبن ".

قەیناکە. سەرباری هەموو ئەو ئاگادارکردنەوە و فەرمانانــە، ئــەو کچــە ئەوەی دەهێنــا. تەنانــەت مــردنیش لەپێناویــدا قــازانج بــوو. وابــزانم گشــت پێوەرەکانمی ئاوەژوو کردبوو.

ئــەو شــەوە هــەر ڕۆژ نــەبووەوە. بــەیانی زوو چــوومە دەرگــای مزگەوتەکە، وەلێ نەهات. بەڵام زانیاری تەواوم دەست کەوت لــەو کچانەی کە لەگەڵمدا لە کۆلێژ کاریان دەکرد:

"کچێکی زیرەکە و دەتوانرێت متمانەی پێبکرێت"...

لەبــەر دروســتی و جــوامێری و شــێوە ژیــانێکی تایبــەت بــە خــۆی، هاوڕێکانی بە " کچی خۆرهــەڵات " بــانگی دەکــەن. دەڵــێن کــە بێجگــە لــە خوێندن و سەرکەوتن بیر لە هیچی تر ناکاتەوە. چەند کوڕێــك ویســتوویانە لێی نزیك ببنەوە، بەڵام هەموویانی ڕەتکردووەتەوە .

کچــی خێزانێکــی هــەژارە و برایەکیشــی هەیــە لــە هــەمان کۆلێــژ دەخوێنێت. بەجووتــە لــە ڕۆژانــی پشــووی هەفتــەدا کاردەکــەن و خــەرجی خوێندنیان دەردێنن. ئەم خوشك و برایەی کە دەســتی یــەکتریان گرتــووە، جگە لە زوو تەواوکردنی زانکۆ هیچ مەبەستێکی تریان نییە .

برادەرەکانم لە کاری فرۆشتنی ماددە هۆشبەرەکاندا لە خەلیلی برای پنار نزیك بووبوونەوە. ویستبوویان بەهۆی ئەوەی کە سەرڕاستە و هیچ گومانێکی لەسەر نییە، لە کارە پیسەکەیاندا بەکاری بهێنن. بۆیە فەقیرە چەند جارێك کێشەی لەگەڵ پۆلیس بۆ دروست بووبوو. منیش ئەوەم لە خوا زانی و چووم خۆمم پێناساند و لە دەستی هاوڕێکانم ڕزگارم کرد. ئەم بابەتەی بۆ خوشکەکەی گێڕابووەوە و ئەویش زۆری پێ خۆشبوو. ئەمەم کرد بە بیانوویەك و دەعوەتم کردن بۆ خواردنگەیەك. بەتایبەتی چێشتخانەیەکی جوان و پارێزکارم هەڵبژارد. پێشتر بە شاگردەکانم ڕاسپارد کە خزمەتێکی تایبەتمان بکەن.

## خۆشترین پەردەی شانۆی ژیانم

چرکەساتی یەکتر بینین شۆکێك بوو. پنار کە منی لە بەرامبەریدا بینی واقی وڕما و، وتی:

- ئا ئا، ئەوە تۆیت؟

نەوەك براکەی بە هەڵە تێبگات یەکسەر وتی:

- خەلیل، ئەم پیاوە لە مزگەوت هاتبووە دەرەوە و لووتی خوێنی لێدەهات. منیش دەستەسڕێکم پێدا. واتە هەر ئەم تۆی لە دەستی پۆلیس ڕزگارکردووە؟

ئاە کچی خۆرهەڵات ئاە! بڕوانن لەو نیەتە پاکەی! وای زانیوە من نوێژخوێنێکم و، بەزەیی پێمدا هاتووەتەوە و، دەستی یارمەتی بۆ درێژکردووم. ئەگەر ئەو کاتە بیزانیایە ئەو نیەتە پاکە چۆن دەیکات بە

قوربانی ژیانێکی بێبەزەیی، دڵنیام هەر لەوێدا پشتی هەڵدەکرد و دەڕۆیشت.

من زۆر سووربووم لەسەر ئەوەی کەمێك دانیشن. بەناچاری و شەرمەوە وتی:

- ئێمە لە خۆرهەڵاتەوە بۆ خوێندن هاتووین.

- خەڵکی چ شارێکن؟

نەیویست زانیاری تایبەتی بدات، منیش زۆرم لێنەکرد .

پاش ئەو دیدارەی یەکەم جار چەندین جاری تر ئەو خوشك و برا دڵساف و بێوەیەم بینی. هەرچەندە ئەوان لە دڵەوە حەزیان نەدەکرد، بەڵام من وا نیشانم دەدا کە بە ڕێکەوت دیومن. وەلێ ڕاستیەکەی ئەوەبوو پێشتر پلانی زۆر وردم بۆ دەکێشا. بەو جۆرە دۆستایەتی نێوانمان تا هات پتردەبوو. بەتایبەتی ئەوەی کە وەکو براگەورەیەك یارمەتی خەلیلم دەدا، دڵی هەردووکیانی خۆش دەکرد .

## دڵیم فڕاند

جا چیم نەکرد لەپێناو بەدەستهێنانی دڵی کچی خۆرهەڵات؟ بە بیانووی جۆراوجۆر زوو زوو لە بەردەمیدا قوت دەبوومەوە. لە هەموو بارێکیشدا خۆم وەکو گەنجێکی دیندار دەردەخست. چەندین مانگ لە دوورەوە چاودێریم کردن. بۆ خۆشیرین کردن، چەندین جار براکەیم تووشی کێشە دەکرد و پاشان کێشەکەم بۆ چارەسەر دەکرد.

له هەموو هەلێکدا سەرسامی خۆم بەرامبەر ئەو شتانە دەردەبڕی کە ئەو بە پیرۆزی دادەنان. لەکۆتاییدا سەرەڕای بەرەنگاری و ڕەتدانەوەیەکی زۆری کچی خۆرهەلات، توانیم سەرکەوتووبم لە ڕاکێشانی دلیدا. ئیتر پەیوەندییەکی ڕۆحی لە نێوانماندا دروست بوو. بەلام هەرگیز کچی خۆرهەلات سنووری نەدەبەزاند و، قەت بە تەنیا لەگەلم نەدەوەستا.

ئەوانەی سەروو خۆم کە بەو پەیوەندییەی منیان زانی چەندجارێك ئاگاداریان کردمەوە. چاوەڕوانبوون بە زووترین کات بیپچڕێنم. دەترسان لەوەی کارەکەم ئاستەنگی بۆ دروست ببێت یان ئاشکرابیم. هەر بۆیە دەیانویست ڕێگریم لێبکەن.

نە خەلیل و نە پنار نەیاندەزانی خەریکی ئەو کارەم. بەلام ئەوانەی سەروو خۆم دیسان لە خەلیلیان هەلپێچابوو. دەیانویست بەوە چاوترسێنی من بکەن.

لەکۆتاییدا خەلیل بە حالی منی زانی و بۆ خوشکەکەی گێڕابووەوە. منیش بە پنارم وت: " جاران لەو جۆرە کارانەوە تێوەگلابووم، بەلام ئێستا وازم هێناوە ". ئەو دوو هەژارەش باوەڕیان بە قسەی کەسێکی وەك من کرد. بەچیدا بزانن تا قوڕگم لە چەپەلیدا نوقم بووم؟ وایان دەزانی هەمووان وەك خۆیان سەرڕاستن.

پاش ماوەیەك داوای هاوسەرگیریم لە پنار کرد. سەرەتا ڕازی نەبوو و رەتی کردەوە. دواتر وتی دوای تەواوکردنی کۆلێژ ئەگەر بتوانێت هەژارانەکەی ڕازی بکات، ئەوکاتە لەوانەیە...

گوێم بە قسەی بازرگانانی ماددە هۆشبەرەکان نەدا و لە کۆتاییدا ئەوەی لێی دەترسام بەسەرم هات. لە ژێرزەمینێکیان هاویشتم و تا بەیانی ئەشکەنجەیان دام. دوو فیشەکیان بە قاچی ڕاستمەوە ناو و ڕۆیشتن. ئەوە دوایین ئاگادارکردنەوەیان بوو، ئەوەم زۆر باش دەزانی.

سێ چوار ڕۆژ نەچووم بۆ زانکۆ. دواتر ناردم بەدوایدا بێت بۆ نەخۆشخانە. نازانم چۆن باسی ئەوە بکەم کە چەند خەفەتی خوارد کاتێک منی بەو حاڵەوە بینی. تێگەیشتم ئیدی جێیەکم لە دڵیدا بۆ خۆم مسۆگەر کردووە. ماوەیەکی دوور و درێژ فرمێسکی بۆ منی بێنرخ هەڵڕشت.

هەرگیز شایستەی خۆشەویستی و سۆزی کچێکی پاك و بێگەردی وەك ئەو نەبووم. زۆرجار بیرم لەوە دەکردەوە واز لەو کچە زیرەکە بهێنم کە داهاتوویەکی پرشنگداری هەیە، بەڵام چی لەگەڵ دڵی سەرشێت دەوترێت؟

پێم وت:

- ویستیان ناچارم بکەن بە کاری ماددە هۆشبەرەکان، ڕازی نەبووم بۆیە ئاوایان بەسەر هێنام .

وەختێك من لە نەخۆشخانە کەوتبووم، دیسان چووبوونەوە وێزەی خەلیل. خەلیل وتبووی: " لای پۆلیس شکات دەکەم". ئەوانیش ترساون و باوەڕیان کردووە. بەداخەوە بێبەزەییانە ئەو گەنجەیان جوانەمەرگ کرد. ئەویش بە دروستکردنی سیناریۆی کارەساتی ئوتومبێل..

خێزانەکەی هاتوون و تەرمەکەیان بردووەتەوە. خێزانێکی هەژار و دەستکورت نەیانتوانیوە پارێزەرێك بگرن و لە دادگا سکاڵا تۆماربکەن،

بۆیە ڕووداوەکە هەر بە نهێنی مارەتەوە. تاوانبارەکانیان حەواڵەی خوا کردووە و گەڕاونەتەوە بۆ شارەکەیان .

پنار حاڵی پەرێشان و خەمزەدەبوو. دوای دە ڕۆژ ئەو ڕووداوەم بیست. کاتێك تەلەفونم بۆ پنار کرد، لەبەر گریان نەیدەتوانی قسەبکات. هەرچەندە ویستبوویان وەکو ڕووداوێکی هاتوچۆ بنوێنرێت، وەلێ پنار لەوە گەیشتبوو کە بەقەست دەستیان چووەتە خوێنی. بۆیە لە تەلەفوندا پێی وتم:

ـ ئەو ستەمکار و بێویژدانانە لەوانەیە ئازاری تۆش بدەن، توخوا ئاگات لە خۆت بێت!

لەو سەروبەندەدا خێزانەکەی ویستیان پنار واز لە خوێندن بهێنێت، دەترسان شتێکیش بەسەر ئەو بێت.

## چوومە داخوازیی پنار

من ئەو بارودۆخەم بە هەل زانی و چوومە داخوازیی پنار. بە ئاسانی ڕازی بوون، چونکە پێیان خۆش بوو کەسێك ئاگای لە کچەکەیان بێت و پارێزگاری لێبکات. باوکە هەژارەکەی وتی: " هەردووکتان ڕۆڵەی منن. ئاگاتان لە یەکتر بێت. کە خوێندنەکەتان تەواوبوو زەماوەندتان بۆ دەکەین ". هەر لەوێدا لەیەکیان مارەبڕین. پاشان لەگەڵ پناردا پێکەوە هاتینەوە.

حاڵ و بارم دوو هێندە گران بوو. پنار وای دەزانی من کەسێکی دیندار و سەرڕاستم و لە زانکۆ دەخوێنم. بێگومان یەك یەك نهێنییە

چەپەڵەکانم ئاشکرا دەبوون. ئەوکات چی دەبوو؟ لە هەمووشی خراپتر، ئەگەر ئەو ستەمکارە بەدڕەوشتانە تێبگەیشتنایە لەوەی بەنیازم لێیان جیاببمەوە، ئەو وەختە چی دەبوو؟

ئەوە خۆم هیچ کە ڕزگارم نەدەبوو. ئەی پنارم چۆن بپاراستایە؟ چۆن دەمتوانی نەهێڵم تێکەڵاوی ئەو دنیا پیسە ببێت؟ هەرچەندە متمانە بە قسەی کەسێکی وەك من ناکرێ، بەڵام پەیمانم بە خێزانەکەی دابوو. هیچ نەبووایە با ئەو بەڵێنەم ببردایەتە سەر، وەلێ چۆن؟

ئاە پنار ئاە! نازانم خانمێکی تری وەك تۆ لەم دنیایەدا هەیە؟ بڵێی کەسێکی تر هەبووبێت وەك تۆ بەڕاستی و پاکی خۆشەویستی و ڕاستگۆیی هەڵگرتبێت؟ وەك دایکێك ئاگاداری لێدەکردم. هەموو دنیای بووبوو بە خەریك بوون بە منەوە. وازی لە خۆی هێنابوو، بەڵام خەو لە چاوی تۆرابوو لە ترسی ئەوەی نەوەك شتێك بەسەر من بێت.

هەرچەندە لە ڕووی شەرعی و یاساییەوە ژن و مێردبووین، بەڵام بە جیاجیا دەژیاین. گەورەترین گوناهی من ئەوەبوو کە هەرگیز شایانی ئافرەتێکی پاك و ناوازەی وەك ئەو نەبووم.

پێکەوە خانوویەکمان گرت. وەلێ ئەوەندەش ئاسان نەبوو. ناچاربووم هەموو مەرجەکانی قبووڵ بکەم تا ڕازی ببێت. دەیویست تا زەماوەندەکەمان لەیەك دووربین. منیش بۆیە ویستم لە ماڵێکدا پێکەوە بژین، نەوەك خوا نەخواستە دەستیان بیگاتێ و بەلایەکی بەسەر بهێنن. هەموو ساتێك گریمانی ئەوە هەبوو پەلامارمان بدەن. هەر بۆیە بەجددی

کەوتبوومە بیرکردنەوە لەوەی شار بەجێبهێڵین و لە گوندێکدا نیشتەجێ ببین .

لە کاتێکدا کە لە لێواری هەڵدێر نزیک بووبوومەوە، کچێکی فریشتەئاسا هات و هەستەکانمی کۆکردەوە و هیوای ژیانێکی نوێی پێبەخشیم. بۆیە دەمویست ئەو خۆشییەم لێ نەشێوێت و دیسان نەگەڕێمەوە بۆ ڕابردوو. هەر بۆیە شەش مانگ بوو خۆم شاردبووەوە و وازم لەو کارە پیسە هێنابوو.

زۆر بەشوێنمدا گەڕابوون. لەکۆتاییدا ئێوارەیەك ئوتومبێلێك لە بەردەم دەرگای ماڵماندا بینرا. چاك دەمزانی ئەوە چ مانایەکی هەیە. کەنعانە زەرد بە تەوسەوە پێکەنی و، بە پناری وت:

– حەزدەکەین دەعوەتێکتان بکەین خوشکێ! بیستوومانە ماڵتان پێکەوە ناوە. ئێمەش لەگەڵ هاوڕێیاندا بڕیارمان دا خۆشترین ئوتێلتان بۆ بەکرێ بگرین بۆ مانگی هەنگوینیتان. چەند ڕۆژێك لەوێ میوانی ئێمەن!

پنارە دڵپاکەکەی منیش بە ڕاست تێگەیشت و، وتی:

ــ زۆر زەحمەتتان کێشاوە براگیان! ئێمە دەزگیرانین، هێشتا زەماوەندمان نەکردووە...

- قەیچێکا براژن! ئەوکاتەش ئوتێلێکی خۆشترتان بۆ دەگرین.

ئەم بێبەزەییانەی کە تۆزقاڵێك هەست و سۆز لە دڵیاندا نەمابوو، هەنگاو بە هەنگاو بەرەو مەرگیان دەبردین. وەلێ نەمهێشت پنار هەست

بـەوە بكـات. خـۆ ئەگـەر ڕاستيەكەشـم پـێ بووتايـە هـيچ ڕێگايـەكی ڕزگاربوونمان نەبوو. هيچ نەبێت با تا كاتی بەڵاكە نەيزانيبا .

لە بەردەم ئوتێلێكی كەشخەی پێنج ئەستێرەييدا وەستاين. برديـانين بـۆ ژوورێكـی زۆر پـاك و خـۆش. كـەوابوو ئێرەيـان هەڵبـژاردبوو وەك دوا وێستگەی ژيانی ئێمە..

ئنجا ئەو شەوە...

بەڵێ، خەياڵی ئـەو شـەوە ئەوەنـدە بـير و هـۆشمی داگيركردبـوو، لـە دەنگی بانگی" ئومێد، ئومێد " ی پنار هاتمەوە سەر خۆم. وتی:

– هـەمووان ئامـادەن و چـاوەڕێی ئێمـەن. خێراكـە لـە نەخۆشـخانە دەردەچين.

پێكەوە چووينە دەرەوە. خواحافيزيمان لە كاك ڕەسوڵ و مەدينەخان دەكـرد كـە بـۆ مـاوەی چـەندين مـانگ وەك دايـك و بـاوكێكی دڵسـۆز هاودەمييـان كـردين. ئـەوان بـە دڵـی خـۆش و ويـژدانی ئاسـوودەوە دەگەڕانەوە بۆ ماڵی خۆيان و ئێمەش دەچووينەوە بۆ ناو ئەو ئـاگرەی كـە هەموو ڕۆژێك چەندەها گەنجی وەك ئێمەی قووت دەدا.

دەنگێكی ناديار لە ناخمدا هاواری دەكرد و كوڵی نەدەنيشتەوە:

– كەس نييە بێت بە هانامانەوە؟

منيش وەڵامی ئەو دەنگەم دەدايەوە:

– بۆچی ڕزگارمان بكەن؟ ڕزگاربوون شايانی كەسانی باش و پاكە. ئـەی ئێمە؟

# بەشی پێنجەم



## ئەو بەرەوپێشچوونەی سەرسامی کردین

لەبەردەم نەخۆشخانەکەدا بووین. لەسەر شەقامەکە ئۆتومبێلەکەی کاک ڕەسووڵمان بینی. ئەو ئۆتومبێلەی لە ئێمەی دا. کاک ڕەسووڵ وتی:

- فەرموون سواری ئەو ئۆتومبێلە دەبین.

واقم وڕما، وتم:

- ئێمەش؟

- یانی چی ئێمەش؟ بێگومان پێکەوە دەڕۆین.

بۆ چرکەساتێك لەوسەری تونێلی تاریکی تەمەنمانەوە تیشکێکی هیوابەخش بەدیارکەوت. چەند جارێك داگیرسا و کوژایەوە، وەك ئەوەی هەواڵدەری جوانییەکی چاوەڕواننەکراوبێت.

لەگەڵ پنار سەیری یەکترمان کرد، وەك ئەوەی بمانەوێت لەو پێشنیارەی کاک ڕەسوڵ تێبگەین. ئەو داوەتەی کاک ڕەسوڵ لە ناخی هەردووکماندا ئومێدیکی ڕزگاربوونی بووژاندەوە، ئەگەرچی دوور و کزیش

بێت. کاک ڕەسوڵ چووە ژێر باڵم و مەدینەخانیش قۆڵی پناری گرت، بەو جۆرە وردە وردە تا لای ئوتومبێلەکە چووین. من وتم:

ـ وەکو دەبینن کاک ڕەسوڵ، ئێمە باشین شوکور. حەزناکەین لەمە زیاتر ببین بە بار بەسەرتانەوە.

ـ ئەو ڕۆژەی کە دڵنیابووین دەتوانن لەسەر پێی خۆتان بوەستن، ماڵئاواییتان لێدەکەین، بەڵام هێشتا نەهاتوونەتە ئەو ئاستە. دوای ڕۆژانی گران و ماندووکار، پێویست دەکات بۆ ماوەیەك میوانمانبن. قاچە دروستکراوەکەی پنارخانیش تازەیە، کاتی دەوێت تا لەگەڵی ڕادێت.

باوەڕمان بە گوێیەکانمان نەدەکرد. زوو زوو لەگەڵ پنار لە یەکمان دەڕوانی و بیرمان لەوە دەکردەوە چی بکەین و، چۆن وەڵامیان بدەینەوە و، بە چ شێوازێك سوپاسیان بکەین. تەواو سەرسام بووبووین.

لە بەرامبەر ئەو چاکەکاریانەدا کە هەرگیز لە ژیانمدا وێنەم نەدیبوون، ئەبلەق بووبووم. ئێمە حەق وابوو تووڕدرێینە کەنارەوە، کەچی ئەوان خۆشەویستی و میهرەبانییەکی فراوانیان پێشکەش دەکردین. ئا لەم نهێنییە تێنەدەگەیشتین. لەگەڵ پناردا ڕازی نەبووین و، وتمان:

ـ ئێوە ئێمە ناناسن. ئێمە کەسانی زیانبەخشین. دەترسین بەهۆی ئێمەوە زیان بە ئێوەش بگات. قەرزاری ئەو هەموو چاکەیەی ئێوەین، تکایە لەوە زیاتر منەتبارمان مەکەن. ئەگەر دەتانەوێت چاکەمان لەگەڵ بکەن، وازمان لێ بهێنن با بە ڕێی خۆماندا بڕۆین.

کاک ڕەسووڵ قۆڵمی زیاتر ڕاکێشا و، وتی:

- جارێ با بتانبەینەوە بۆماڵەوە، تا شەکەتیتان دەرچێت. دواتر قسە لەمانە دەکەین. نەمانتوانی لەوە زیاتر مشتومڕیان لەگەڵ بکەین. بەناچاری سواری ئۆتومبێلەکە بووین. چەند سەیربوو! ئەو ئۆتومبێلەی ئێمە خۆمان نایە ژێری و شێلاینی، وەك ئەوەی بیەوێت داوای لێبوردن بکات، ئێمەی خستە باوەشی و ئامادەبوو بمانگوێزێتەوە. ئەو دوو کەسەش کە لە ئێمەیان دابوو، بووبوون بە دایك و باوکمان و لەپێناو ئارامی و ئاسوودەیی ئێمەدا باڵەفرەیان بوو. خۆزگە ئێمەش شایانی ئەم هەموو چاکەکارییانە دەبووین...

ئۆتومبێلەکە بەڕێکەوت. چووینە ناو گەڕەکێکی کەشخەوە کە زیاتر کەسانی دەوڵەمەند لەو ناوچەیەدا دەژیان. ئێمە باش شارەزای ئەو دەڤەرانە بووین، چونکە ساڵانێکی زۆر تێیاندا بەدوای گەنجی پارەداردا دەگەڕاین تا گیرۆدەی ماددە هۆشبەرەکانی بکەین. لەوانەیە سەدان جار بەبەردەم ئەو دەرگایانەدا تێپەڕیبم. چەندین لاوی پاك و بێتاوان بەهۆی خیانەتی ئێمەوە ژیانیان بوو بە دۆزەخ. لەبەرئەوە ئەم شوێنانە سەبارەت بە ئێمە مەترسیداربوو، چونکە هەموو چرکەیەك دەگونجا هێرش بکرێتە سەرمان .

## پلانێکی وەها تۆکمە

لەبەردەم ئەپارتمانێکدا وەستاین. ماڵی کاك ڕەسوڵ لە قاتی سەری سەرەوەبوو. جێیەك بوو دەیڕوانی بەسەر دارستانێکی سەوزدا و، دڵ و هەناوی مرۆڤی فێنك دەکردەوە. مەدینەخان وتی:

- ماوەیەك لێرە میوانمان دەبن. پاش چەند مانگێكیش دەگوازینەوە بۆ شارێكی تر. كاك ڕەسوڵ پلانێكی وای داڕشتووە. چونكە ئێمە زۆر ناسراوین لێرە، دەترسین شتێكتان بەسەر بێت.

ئێوە لەو میهرەبانی و خەمخۆرییە بڕوانن! ئەم دوو مرۆڤە چاكەكارە ناو دڵی ئێمەیان دەخوێندەوە. بیریان لە چی دەكردەوە بۆ دابینكردنی ئاسایش و ئارامی بۆ ئێمە؟ كەوایە ئەوەی كە كۆمەڵگا هێشتا بەپێوە ماوە و نەڕماوە، هۆكارێكی هەیە. كەوایە هاوسەنگی دنیا ئەم كەسە باشانە ڕایانگرتووە.

ئەو هەموو فیداكارییەی كە بۆ كەسانی سادە و ئاسایی وەك ئێمە دەیانكرد!.. هەرچەند بیری لێدەكەمەوە ئەقڵم نایبڕێت.

ڤاتێكی تەواویان بۆ ئێمە تەرخان كردبوو. دەتووت ماڵەكە بە خۆشترین بۆن شۆرراوە، چونكە هەواكەی زۆر ئارامی بەخش بوو. ئێمە قەت هەلی ئەوەمان بۆ هەڵنەكەوتبوو لە شوێنێكی ئاوادا شەوێك ڕۆژبكەینەوە. هەرچەندە بەڕواڵەت پاك دیاربووین، وەلێ ناوەوەمان هێندە تاریك بوو كە نەمدەزانی چەندێك دەتوانین تامی ئەو ئاسوودەییە بێسنوورە بكەین.

هیواداربووم ئەمشەو لەو شەوە نەچێت كە بردیانین بۆ ئوتێلێكی پێنج ئەستێرەیی. چونكە ئەو شەوە لەگەڵ پێناردا سزای دۆزەخمان چەشت. لەوانەیە ژوورەكان و كەلوپەلەكان پلە یەك بووبن، بەڵام ئەو ئازارەی نۆشیمان ئەویش هەر پلە یەك بوو.

# بەشی شەشەم



## ئەو شەوەی مێشکی دەهاڕی

ئەو شەوە..!

ئاە، بریا هەر نەمدیبا! خۆزگە نەهاتایەتە ژیانمانەوە! ڕابردووی پاکی پنار ئەو شەوە سڕایەوە. ئەو شەوەبوو کە تیایدا هەموو دروستی و چاکە و هەستی بەزەییەکی لە ئێمەدا کوژاندەوە...

ئاە، ئەو شەوە!

دیسان داڵغەی ئەو شەوە لێی دابووم. ئەگەر ئەو شەوەمان بەسەرنەهاتایە، ڕەنگە ڕزگاربوون لەم ژیانە نەفرەتییە ئاسانتربووایە.

ئەو شەوە ڕێزێکی زۆرمان لێنرا و خزمەتێکی بێئەندازە کراین. لە دوو قۆچی قوربانی دەچووین کە بۆ قەڵەوبوون خۆراکیان پێدەدرا. سیناریۆیەك بوو باش دارێژرابوو.

لە ژوورەکەدا تەنها جێخەوێکی دوو نەفەری تێدابوو. پنار وتی:

- من ئاوا ناخەوم.

- باشە. تۆ لەسەری بنوو، منیش بەتانییەك ڕادەخەم و لە زەوییەکە دەنووم.

- نەخێر، نابێت. زەوییەکە ساردە، نەخۆش دەکەویت. من لەسەر زەوی دەنووم.

لە دڵی خۆمدا دەمووت: " خوایەگیان، من شایستەی ئەم خۆشەویستییەم؟ ئەوینی پنار چەند پاك و ڕوونە" !

هەڵسوکەوتی کچی خۆرهەڵات ئەوەندە کاری لێدەکردم، دڵنیام ئەگەر ژیانمان ئاسایی و وەکو خەڵك بووایە، منی لەو بێسەروبەرییە دەردەهێنا و دەیخستمە دنیای مەعنەوی و جوانی خۆیەوە. بەڵام بەداخەوە ئێمە ئەو هەلەمان لەدەستدابوو!

تا دەهات دوودڵی و بێقەراریم زیادی دەکرد. ڕۆحم هاتبووە کونی لووتم، چونکە هەموو چرکەیەك دەگونجا کارەساتێك تێیدا ڕووبدات. زۆری نەبرد دەنگی تەلەفون هات. لێپرسراوی پرسگەی ئوتێلەکە وتی:

– بەڕێزم، لە خوارەوە چاوەڕێتن.

تێگەیشتم، بەڵام نەمهێشت پنار هەست بە هیچ بکات. وتم:

– حەتمەن برادەرانن. ئەمشەو ناهێڵن خەو بچێتە چاومان. وا دەزانن مانگی هەنگوینییە. دەچم بزانم چی دەڵێن. زۆرم پێناچێت دەگەڕێمەوە.

جلەکانم گۆڕی. دەمزانی شتێکم بەسەر دەهێنن، بەڵام سەبارەت بە پنار گومانێکم نەبوو. باوەڕم نەدەکرد دەستیان بچێتە ئافرەتێك .

چـوومه خـوارەوە. کەنعانــە زەرد و ئەیوبــە ڕەش و جەلالــە ســوور چاوەڕێیان دەکردم. هەوڵم دا خۆم ئاسایی دەربخەم و، وتم:

– خێرە ئەوە کوڕینە، بەم نیوەشەوە چ باسە؟

جەلالە سوور وتی:

– نە بابە! ئێمە نامێڵین هاوڕێکەمان لە شەوێکی ئاوا تایبەتدا پرخە پرخ بنووێت. وتمان با تۆزێك ڕابووێرین، بەشکم نوخشە بێت لە ئێمەش!

تۆزقاڵێك ڕاستگۆیی و دڵسۆزی لـە ڕوخسـاریاندا نـەبوو. ئـەوەی کـە دەیانووت: "دەمانەوێت ڕابووێرین"، درۆیەکی شاخداربوو. دڵم تەپەتـەپی بوو، چونکە هەموو ساتێك چاوەڕێی ئەوەبووم ئەم یارییـە بـە کارەسـاتێك کۆتایی بێت .

دانیشتین. باسـی شـتی ئاسـاییمان کـرد. خواردمـان و خواردمانـەوە. جەلالە سوور زەنگی تەلەفونەکەی لێیدا و پاشان هەستایە سەرپێ. وتی:

- دەی هاوڕێیان، شەو درەنگی کردووە. با ئومێدیش خـەوێکی خـۆش بکات. ئێمەش دەچین سەرمان گەرم دەکەین .

ڕۆیشـتن. هـیچ تێنەگەیشـتم. ئـەوان بـەو نیوەشـەوە تـەنها بـۆ ئەمـە هاتن؟

## هەموو شتێك دوایی هاتبوو

چـوومەوە بـۆ ژوورەکـەمان. بینـیم ئـەو دەرگایـەی کـە بـە کلیـل دامخسـتبوو کراوەیـە. بـە گومانـەوە چـوومە ژوورەوە. نـاوەوە دەتـووت

مەیدانی جەنگە، هیچ بەسەر هیچەوە نەمابوو. پنار لە خوێنی خۆیدا گەوزابوو.

شێت بووم، ئاگام لە خۆم نەما. نازانم لەژوور سەری پناردا کە بووژابووەوە چیم وت و، چەند هاوارم کرد و، چەند جوێنم دا. دنیام ڕووخا و، هیوام بڕا و، ئەو تۆزە هەستە باشەی تیامدا بووژابووەوە، کوژایەوە و سەرتاپا تاریکی دایپۆشیم. ئیتر لەبەر چاومدا هیچ جوانییەك نەما. دەمویست ئەو جانەوەرانە، ئەو کەلاکە گەنیوانە، ئەو ئاژەڵە چەپەڵانە بە دەستی خۆم لەت لەت بکەم .

بە دەستی خۆم ژیانی پنارم وێران کرد. ئەو پنارەی دڵم نەدەهات دەستم بەری بکەوێت. ئەو کەسەی کە نموونەی شەرم و شکۆ و، سەرمەشقی فیداکاری و، سەرچاوەی ڕاستگۆیی و دڵسۆزی بوو.

ئەم چەتە ستەمکارانەی کە لە بچووکترین دەرفەت دەگەڕان بۆ کوشتنی ڕۆحی نەتەوە و بەکۆیلەکردنی گەنجان و، ژەهراوی کردنی خوێنیان، لە کۆتاییدا پناریشیان تووشی ئەو ژەهرە کرد و چی پاکی و چاکی لەودا هەبوو بردیان.

وەرە و خۆت بگرە ! وەرە و مەمرە ! وەرە و شێت مەبە!

دەمتوانی چی بکەم بەرامبەر سوپایەکی چەکدار؟ جگە لە خۆخواردنەوە و نەفرەت لە خۆکردن، دەمتوانی چی بکەم؟

ئەوان گروپێکی زەبەلاح بوون کە بە فرۆشتنی ماددە هۆشبەرەکان پارەیان کۆدەکردەوە. دەیانتوانی هەموو جۆرەکانی چەك دەست بخەن.

واتە وەك سوپایەکی بێناو وابوون. بە مردنی یەك دووانێکیان کار تەواو نەدەبوو. تۆڵەم لە کێ بکردایەتەوە؟

پنار هەر نەدەهاتەوە سەر خۆی. چەندین مانگ لە شۆکدابوو. چیتر نەدەژیا. هەموو ئەو بەهایانەی دۆڕاند کە بەلایەوە پیرۆزبوون. نەیدەتوانی هەرگیز ئەوە بە خێزانەکەی بڵێت. بەو حاڵەشیەوە نەیدەتوانی بگەڕێتەوە بۆ ژیانی دیندارانە و دۆخی ئاسایی جارانی.

چرکەیەك نەبوو نەقیژێنێت و ئاخ و ئۆف هەڵنەڕێژێت. وازی لە پەرستشەکانیشی هێنا. چونکە دەیووت: " من بەم حاڵەوە چۆن ڕووم بێت بچمە حزووری خوای خۆم؟ "

ئیتر ڕۆحی لە پاکی و جوانی داماڵرا و سەرتاپای پڕبوو لە یاخیبوون و سەرپێچی. ئیتر من و ئەو دوو کەس بووین کە پشتمان لە هەموو شتێك هەڵکردبوو و، قسەمان لەگەڵ دنیا دابڕیبوو و، مۆری خراپیمان لەسەر گشت شتێك و کەسێك دانابوو .

بڕیارمان دا دەستی یەك بگرین و تۆڵە لەو کەسانە بکەینەوە کە ئێمەیان بەو دەردە گەیاند. لەوانەیە بەو شێوەیە کەمێك لە کڵپەی ناخمان هێوربکردایەتەوە. بەجۆرێك گۆڕابووین بۆ دوو ڕۆبۆتی بێهەست و بێگیان، دڵمان لە ئاگری تۆڵەسەندنەوە تەنی بوو. جگە لەمە بیرمان لە هیچی تر نەدەکردەوە .

ئەوانەمان دەکوشت کە ئێمەیان کردبوو بە تەرمی زیندوو. پاشان بۆ ئەوەی لەوە زیاتر جەفای دنیای فانی نەکێشین، خۆمان دەکوشت. ئەمە

بڕیارەکەمان بوو. چونکە پنار نیازی ئەوەی نەبوو بەو لەکە و سەرشۆڕییەوە بژی، بەتایبەتی نەیدەویست قسە بهێنێتە سەر خێزانەکەی.

## خستبوومانە مێشکمانەوە

ئێمە وەك ئەوەی هیچ نەبووبێت بەردەوام بووین لەسەر فرۆشتنی ماددە هۆشبەرەکان. چاوەڕوانی کات و شوێنی گونجاومان دەکرد .

زانیمان کە ئەو کارەساتە کەنعانە زەرد و ئەیوبە ڕەش و جەلالە سوور ڕێکیان خستووە. ئەوانەش کە ڕاستەوخۆ بەلاکەیان بەسەر پناردا هێناوە، کەمالە شەل و شێخۆ بێپەنجە بوون .

بەجۆرێك ڕق و نەفرەت لە سینەماندا پەنگی خواردبووەوە نەماندەزانی لە کوێدا ڕاست دەکەین و لە کوێدا هەڵە. ئەوە هیچ کە لە ژیانی مندا شوێنێك نەبوو بۆ ڕاستی. لەوانەیە تاقە ڕاستێك ئەوەبێت کە پنارم ناسیوە. کەچی من ژیانی ئەو کچە هەژارەم شێواند و دنیام لێ کرد بە دۆزەخ. بەڵام ئەو دڵێکی وای هەبوو سەرەڕای هەموو ئەو نەهامەتییانە بە تەنیا جێی نەهێشتم و شان بە شانم بەپێوە وەستا. تەنها یەك دوعای لە خوا هەبوو:

– خوایە، تا تۆڵەی حەیام نەکەمەوە گیانم مەکێشە!

لە هاوڕێیەکمەوە زانیم کە فلانە شەو کەنعانە زەرد و ئەیوبە ڕەش و جەلالە سوور لە فیسارە ماڵ کۆدەبنەوە. نەدەبوو ئەو هەلەمان لە دەست بچێت. وەلێ ئەو دووانەی کە ڕاستەوخۆ ئاگریان تێبەردایت، واتە کەمالە

شەل و شێخۆ بێپەنجە، لەوێ نەبوون. ئەگەر لەو هێرشەدا شتێك بەسەر خۆمان بهاتایە، ئەوکاتە ئامانجە سەرەکییەکەمان لەکیس دەچوو .

پلانەکەمان گۆڕی. بڕیارمان دا هێرش بکەینە سەر کەمالە شەل و شێخۆ بێپەنجە و، گروپەکەی تر لای پۆلیس ئاشکرا بکەین. لەڕاستیدا دەمانزانی ئەوە هەڵەیە. قین و ڕقی دڵمان ئەوەندە پەنگی خواردبووەوە، نەماندەتوانی لەوە زیاتر چاوەڕوان بین .

پۆلیس ئەوانی گرت. وەلێ تێگەیشتن کە ئێمە هەواڵمان لێ داون. بۆیە بووبووین بە ئامانجێکی سەرەکی بۆیان. هەموو چرکەیەك هەستمان بە بۆنی باروت دەکرد لەبەر لووتماندا. نەك ئەوەی لە مردن بترسین، بەڵکو زنۆقمان چووبوو لەوەی تۆڵەی خۆمان نەکەینەوە و بمرین.

ویستمان تەڵەیەکی ژەهراوییان بۆ بنێینەوە. بە یەکێك لە فرۆشیاری ماددە هۆشبەرەکانم وت: " ئەمشەو لە فلانە جێگا دەبم، ئەگەر حەزت کرد تۆش وەرە ". بەئەنقەست وام وت. دەمزانی خێرا ئەو هەواڵە بە کەمالە شەل و شێخۆی بێپەنجە دەگەیەنێت.

شوێنەکە ژێرزەمینی بینایەك بوو. چەپەك و دوورەدەست و تاریك...

دەمانزانی ئەمە دوایین هەلمانە، بۆیە پلانێکی توند و تۆڵمان داڕشت. چەکەکانمان ئامادەکرد. بڕیار وابوو پنار دەرگاکە بکاتەوە. منیش لە پشتی سپێرێکەوە دەمبێژان. هیچ نەبێت دەمانکوشت و دەکوژراین. لانی کەم ئەمە دڵۆپێك ئاوی دەکرد بەو گڕەدا کە دڵمانی تەنیبوو.

بیرم نایەت لە ژیانمدا بەقەدەر ئەو شەوە لە خوا پاڕابێتمەوە. دەمووت خۆزگە دەهاتن و حەقمان لەوانە دەکردەوە کە ئەو تالآوەیان پێ نۆشین .

درەنگانێکی شەو لە دەرگا درا. پنار لە کونی دەرگاکەوە سەیری کرد و ئاماژەی بۆ کردم کە هاتوون.

لە تەنیشت دەرگاکەوە خۆم لە پشتی شتێکەوە داشاردبوو. لەپێشدا کەمال بە شەلەشەل هاتە ژوورەوە، دەمانچە بەدەستیەوە بوو. شێخۆی بێ پەنجەش بەدوایدا. ئەویش چەکی پێ بوو.

بە جوێن و هەرا هەواڵی منیان پرسی. پنار زۆر لەسەرخۆ و ئاسایی وتی:

– چووە بۆ ئیش، لەوانەیە درەنگ بێتەوە. هەرکە پنار هێنانیە ژوورەوە و دەرگاکەی داخست، دەستم نا بە دەمانچەکەدا. گوللەیەك بەر سەری کەمالە شەل کەوت و دەستبەجێ لە شوێنی خۆیدا کەوت. هێشتا شێخۆی بێپەنجە تێنەگەیشتبوو لەوەی چی ڕوودەدات، دوو فیشەکیشم نا بەویشەوە. بەر چەناگە و سنگی کەوت. لە ئەرزەکەدا کەوتبوون .

چەکەکەم دا بە پنار. ئەو چەندین مانگ بوو چاوەڕێی ئەم چرکەساتەی دەکرد. پنار لەجێی خۆی وشك بووبوو. بە سەرسامی و چاوی کراوەوە سەیری گیاندانی ئەوانی دەکرد. وتم:

– بیگرە. تۆش بەشی خۆتیان پێوە بنێ...

تەنها وتی:

- حەواڵەی خوایان دەکەم.

پێش ئەوەی خەڵکی دەوروبەر و پۆلیس بگەنە سەرمان هەڵهاتین .

چیتر نەدەژیاین. تەمەنی ئێمەش تەواو بوویوو. لەمەودوا چییان لەدەست بهاتایە بۆ کوشتنمان درێغییان نەدەکرد. دەبوو پێش ئەوەی ئەوان دەستیان بمانگاتێ و هەمان بەڵای جاری پێشوو بەسەر پناردا بهێننەوە، ئێمە خەمی خۆمان بخۆین. هۆکاری ئەوەی دەمانویست خۆمان بکوژین هەر ئەمەبوو .

# بەشی حەوتەم



## لە کوێوە بۆ کوێ؟

بە دەنگی مەدینەخان لە خەیاڵ ڕاپەڕیم .

- کاک ئومێد، پنارخان، نان ئامادەیە!

چووینە خوارەوە. دیمەنە پچڕپچڕکانی ژیانێکی پڕ ناسۆر و ماتەم، مێشکمی کردبوو بە مەیدانی جەنگێکی بێئامان. پنار قاچە دروستکراوەکەی ئازاری دەدا، بەڵام هەرگیز دەری نەدەخست. دەیووت: " ئیتر لەمە باشتر نابێت."

خوانێکی قەشەنگ ڕازێنرابووەوە. کاک ڕەسوڵ تەماشای پرۆگرامێکی تەلەفزیۆنی دەکرد. لەسەر کورسیەکانمان دانیشتین. کاک ڕەسوڵ بە چاوی تەڕەوە ئاوڕی بۆ داینەوە و، وتی:

- دەزانن، ئەم زاتە زۆر جوان و ناوازە وتار دەدات.

بینیم چاوی پناریش پڕبووبوو. بە دەنگێکی لەرزۆکەوە وتی:

- دایکیشم زۆری خۆشدەویست.

دالّغەی ڕۆیشت. حەتمەن بە باڵی ئەندێشە گەڕاوەتەوە بۆ ڕۆژە پاك و جوانەکانی. ئەو کاتەی کە کچێکی ئیماندار و داپۆشراوبووە...

لە کوێوە بۆ کوێ؟

دیسان نەمدەتوانی دەنگی ناخم کپ بکەم:

— من چۆن ئەو بارە گرانە لە ئەستۆ بگرم؟ چۆن بەم ئازاری ویژدانەوە بژیم؟ چۆن لەم بەرپرسیارێتییە ڕزگارم ببێت؟

بڕوانن چیم بەسەر کچێکی بێتاوان و هەژار هێنا. خوا من بگرێت!

لە لایەك نانمان دەخوارد و لە لایەك تەماشای پرۆگرامەکەمان دەکرد. بەتایبەتی ئەو ڕستانەی سەبارەت بە " ئامانجی مرۆڤ " دەوتران-زۆر کاریان لێ کردم:

— ئەگەر بەدیهێنراوان بە درەختێك بچوێنین، ئەوا مرۆڤ بەرهەمی ئەو درەختەیە. هەروەك چۆن لە درەختدا ئەو هەموو کارە سەرسووڕهێنەرانە ڕوویان لە میوە و بەرەکانی ئەو درەختەیە، بەهەمان شێوەش هەموو دروستکراوانی گەردوون خراونەتە خزمەتی مرۆڤەوە. واتە لەو درەختەدا هەموو خانەکان و توخمە سەرەکییەکانی چەشنی " ئاو و هەوا و خاك و تیشك " و، هەموو ئەو ماددانەی تر کە درەخت پێویستی پێیەتی، پێکەوە ڕوویان کردووەتە میوەکە و بۆ یارمەتیدانی ڕێکەوتوون. دەڵێی دەستی یەکیان گرتووە بۆ پێگەیاندنی ئەو بەرە و خزمەت کردنی. ڕاستتر بڵێین ڕامکراون و خزمەتیان پێدەکرێت. بەهەمان جۆر مرۆڤیش میوەی درەختی بوونەوەرانە. هەموو شتێك ڕووی لەوە و خزمەتی دەکات. هەموو شتەکان

ملیان بۆ کەچ کردووە و لەژێر فەرمانیدان. سوود و ئامانجی هەموو شتێك ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ ڕووی لە مرۆڤە. هەموو شتێك وەك فەرمانبەرێك ئەو ئەرکە جێبەجێ دەکات کە پێی سپێرراوە. هەموو شتەکان ملکەچی خوای باڵادەستن و ئەرکی سەرشانیان بە باشترین شێواز ڕادەپەڕێنن.

واتە لە ڕواڵەتدا مرۆڤ بچووکە، بەڵام ئەو مانایەی کە هەڵیگرتووە هێندە گەورەیە، کردوویەتی بە بەری درەختی بوونەوەران و، جوانترین شاکار و، بەڕێزترین بەدیهێنراو... بەجۆرێك هەموو گەردوونی بۆ ژێربار خراوە. هەریەکێك لە ئێمە دەتوانێت بڵێت خۆر لەبەر من هەڵهات و گەرمی بۆ من دەبەخشێت. مانگ و ئەستێرەکان چرای ڕووناککەرەوەی شەوانمن. سفرەیەك بە ئەندازەی زەوی بۆ من ڕاخراوە. هەموو شتێك تایبەتە بە من. ئەی ئاژەڵان؟ ئەوان وان؟ گەرچی زیندەوەران و ڕووەکەکانیش سفرەی تایبەتییان بۆ ئامادە کراوە، بەڵام بەقەدەر ئەوەی من فراوان و تایبەتی نییە. ئەوان بە چەند ڕزقێکی سنووردار بەخێودەکرێن، وەلێ من لە گشت لایەکەوە نیعمەت و بەخشش و لوتفم بەسەردا دەبارێنرێت. بەهاران گوڵ و گەڵا و میوەی تازە لە جیهانی غەیبەوە بۆم ڕەوانە دەکرێت. بە بیرکردنەوە لە هەموو ئەمانە، ئایا مرۆڤ وا هەست ناکات کە میوانێکی ڕێزلێگیراوە؟

لەڕاستیدا هێز و دەسەڵاتی من ناتوانێت ئەمانە فەراهەم بکات. کەواتە کەسێك هەیە کە دەمناسێت و میهرەبانە لەگەڵم. هەموو پێداویستییەکانی

من دەزانێت و گرنگیم پێ دەدات. تەنانەت لە هەمووان زیاتر منی خۆشدەوێت. وەك ئەوەی میوانێکی ئازیزی بم، سفرەیەکی پان و بەرینی بۆ ڕاخستووم بۆ تێرکردنی گەدە و ژیری و خەیاڵ و ئەندێشە و ڕۆح و هەموو ئەندامە هەستیار و نهێنییەکانی ترم. تەنانەت خەیاڵ و ئارەزوو و داخوازییەکانم دنیا تێدەپەڕێنن و تا هەتاهەتایی درێژدەبنەوە. بەڵێ، کۆمەڵێك هەست و داخوازیم هەن کە بەم دنیایە تینوویەتییان ناشکێت. ئەو کەسەی ئەم هەست و ئەستانەی لە ناخی مندا چاندووە، بێگومان دەیەوێت شتێکم پێ بڵێت. پێم دەڵێت:

"ئەو هەست و ئەستانەی لە تۆدا چێنراون وەکو تۆوێك وان و لە بەهەشتدا بەر دەگرن. وە تۆ هەڵبژێرراویت بۆ بردنەوەی بەختەوەری هەمیشەیی" .

بەڵێ، نموونەیەکت دەوێت بۆ هەموو ئەمانە؟ کەوایە سەیری منداڵێك بکە لە سکی دایکیدا. ئەو چاو و گوێ و دەست و قاچەی بۆ پێدراوە؟ بۆ ئەوەی هەر لە سکی دایکیدا بمێنێتەوە؟ گەر وابێت تەنها وێلاشێکی بەس بوو کە لە جەستەی دایکیەوە خۆراکی بۆ بگوازێتەوە. ئیتر ئەو هەموو ئەندامانەی بۆچی بوو؟ کەواتە لەو شوێنە تەسکەوە گەشتێك هەیە بۆ شوێنێکی فراوانتر .

زۆر ڕاست بوو. گەشتێك هەبوو. زۆر باش تێگەیشتبووم لەوەی کە ئەوە ئێمە نین کە گەشتەکە و ڕێگەکە دیاری دەکەین. هێزێك هەروەك چۆن نەخشەی بۆ هەموو شتێك کێشابوو، ئاواش بەڕێوەی دەبرد. باشە

ئەگەر نەخشەکێش ئەوبێت و، بکەر ئەوبێت و، هەڵسووڕێنەر ئەوبێت، ئیتر ئێمە چ تاوانێکمان هەبوو کە ژیانێکی باشی بۆ ئێمە بڕیارنەدابوو؟ بۆچی قەدەری ئێمەی بە خراپ نووسی و ئێمەی تووشی ئەم حاڵە کرد؟

## قەدەر بوو بە پرسیار بۆم

بێ ئەوەی بە خۆم بزانم ئەو پرسیارەم لەژێر لێوەوە کردبوو. لەو ماوەیەی کۆتاییدا ئەو خووە سەیرەم پەیداکردبوو. لەگەڵ خۆمدا بە دەنگی بەرز دەدوام. کاک ڕەسوڵ زەردەخەنە گرتی و، وتی:

ـ بێگومان بیرکردنەوەت بەم شێوەیە لەدوای ئەو هەموو ڕووداوە نازاربەخش و ئەزموونە تاڵانە، شتێکی سروشتییە. دەزانیت، منیش سەردەمێك بابەتی " قەدەر " بیرمی ئاڵۆز کردبوو. هەموو خراپەیەکم دەخستە ملی قەدەر و گشت چاکەکانم بە هی خۆم لە قەڵەم دەدا. بەڵام کتێبێکم دیتەوە کە لە مەسەلەکەی گەیاندم و بۆچوونی گۆڕیم. نە تەنها لەم بابەتەدا، بەڵکو لە چەندەها بابەتی تری ئاڵۆزدا یارمەتی دۆزینەوەی وەڵامی ڕاست و دروستی دام. دەتوانم بڵێم بە خوێندنەوەی ئەو کتێبانە دیسان جارێکی تر خۆمم دۆزییەوە. هەزاران کێشە لە دڵ و مێشکمدا چارەسەربوو. بەهۆیەوە هەناسەیەکی ئاسوودەم هەڵکێشا. ناڕەحەتییە دەروونی و بێتاقەتییەکانم لەناوچوون.

ـ ئەو کتێبانە ناویان چییە؟

ـ پەیامەکانی نوور. ڕاڤەی قورئانی پیرۆزن. بەرهەمەکانی مامۆستا سەعیدی نوورسین. وەرگێڕاون بۆ زۆربەی زمانەکانی جیهان. خەڵکێکی

زۆر لـه هـەموو چـین و توێـژە جیاوازەکـان دەیانخوێننـەوە و سـوودیان لێوەردەگرن.[1]

جـۆش و خرۆشـم تـاوی سـەند. دەمویسـت چـی زووە لـەو هـەموو پرسیارە بێزارکەر و چەندبارانەی ناخم ڕزگارم ببێت. وتم:

- باشە، لە کوێ ئەو کتێبانەم دەست دەکەوێت؟

- ئێمە هەمانە. پشت بەخوا بە تێر و تەسەلی پێکەوە دەیخوێنینەوە و دەبینیت کە زۆر سوودی لێ دەبینین. ڕۆژانە بابەتێك هەڵدەبژێرین و هەوڵی

---

١- پەیامەکانی نوور کۆمەڵە پەڕاوێکن کە ژمارەیان لە سەد و سی دانە پەیام تێپەڕ دەبێت و لە دانراوەکانی زانای گەورەی کورد مامۆستا سەعیدی نوورسین. ئەو پەیامانە وەرگێڕراونەتە سەر زۆربەی زمانەکانی جیهان و لە سەرتاسەری جیهاندا موسوڵمانان لە گشت و چین و توێژە جیاوازەکان سوودی گەورەی لێ دەبینن. گرنگترین تایبـەتکاریی ئەم پەیامانە لەوەدایە کە: تەفسیرێکی خەستوخۆڵی ڕاستییەکانی قورئـانی پـیرۆزە و، بـە (مەوسـووعەیەکی ئیمـانی)ی بایەخـدار دادەنـرێن و، بـەدەم خواسـتە ئیمانیـەکانی خەڵکی سەردەمەوە دەڕۆن و، ئیمانی حەقیقی لە دڵ و دەروون و بـیر و ژیریـی مرۆڤـی هاوچـەرخدا دادەمـەزرێنن و، بینـای کـوفر و ئیلحـاد لـە بنج و بێخـدا هەڵدەتـەکێنن و، قەڵای مەحکـەمن بۆ ئیمانـداران و، گـرنگترین چـەکی پێشـکەوتووی " ئیمـان "ن لـەم سەردەمەدا، کە نوێترین چەکی فـرت و فێڵـی کـوفر و ئیلحـادی تێـدا بـەکاردەهێنرێت! مامۆستا فارووق ڕەسوڵ یەحیا تا ئێستا لە شێوەی چەند بەرگێکی نایاب و قەشـەنگدا نیوە زیـاتری پەیامـەکانی کـردووە بـە زمـانی شـیرینی کـوردی و خزمـەتێکی گـەورەی کردووە بە کتێبخانەی کوردی. لە خوای گەورە داواکارین کە پاداشتی بەخێری بداتەوە و سەرکەوتووی بکات لە وەرگێڕانی ئەو پەیامانەدا کە ماون. (وەرگێڕ)

وەڵامدانــەوەی ئــەو پرســیارانە دەدەیــن کــە دنیــای ناوەوەیــان هەراســان کــردووین. ئێــوە جــارێ پشــووبدەن و بێنــەوە ســەر خۆتــان، ئــەوی تــری ئاسانە...

### باوکم حەیرانی بوو

بۆ ساتێك من و پنار لە یەکمان ڕوانی. بینیم لـە جـوانترین چـاوەکانی دنیاوە فرێسك ڕیزی بەستووە و بە گۆنایدا دێتە خوار.

پێش من بە سەرسووڕمانەوە مەدینەخان لێی پرسی:

ـ خێرە ئەوە کچم؟ شتێك بووە؟

سەری کز کرد. چاوی سڕی. پاشان بە دەنگێکی نزم کە خەمی لەگەڵ خۆی هەڵگرتبوو، وتی:

ـ بـاوکم حـەیرانی ئـەو کتێبانـەبوو. هـەموو کتێبـەکانمان لـە ماڵـەوە هەبوو. هەمیشە هانی دەدایـن بۆ خوێندنـەوەیان. مـن کچـی پیـاوێکی وام. ناتوانم بۆ چرکەیەکیش خێزانەکەم لە بیرم دەربکەم. ئەوان کەسانێکی پاك و بێگـەردبوون و ئامـادەبوون لەبـەر مـن گیـانی خۆیـان بـدەن. ئومێـدێکی زۆریان بە من بوو. ئەی من چیم کرد؟ من خـۆم تووشـی چ گوناهێـك کـرد؟ هیوای خـۆم و خێزانەکـەمم ژاکانـد. ئـەوەی مـن کـردم هـەرگیز لـە شـان و شکۆی ئەو خێزانە نییە. بەتایبـەتی بـۆ کچـێکی خۆرهـەڵات هـەرگیز جێـی قبووڵکردن نییە.

خۆی بۆ نەگیرا، فرمێسك تێکەڵی هەنسکی بوو. بۆ ساتێك کەشی پڕکرد لە خەم و دڵتەنگی. مەدینەخان وەك دایکێکی میهرەبان باوەشی پێداکرد و سەری نا بە سنگیەوە و، وتی:

ـ من ئەو ناوچەیەی ئێوە دەزانم پنارگیان! خەڵکی خۆرهەلات جیاوازن. بۆ ئەوان ڕاستگۆیی و شەرەف و خزم و خێزان پیرۆزن. یەکتری دەپارێزن و لەپێناو یەکتردا خۆیان بەخت دەکەن. بەرامبەر کەسی بێگانەش میوانپەروەر و جوامێرن. میوان لە ماڵیاندا خۆی بە پاشا دەزانێت. هەموو جۆرە ڕێز و حورمەتێکی لەڕوودا دەنوێنن. ئەوان بێ یەك و دوو لەپێناو باوەڕ و خێزان و نیشتیمانیاندا گیانیان بەخت دەکەن. پێویستە سوپاسی خوا بکەیت کە کچی خێزانێکی وایت.

دڵتەنگ مەبە!.. تۆ ئەوانت شەرمەزار نەکردووە. بێ ویستی خۆت ژیان دووچاری تەڵە تاریکەکانی خۆی کردیت، بەڵام دڵنیام تۆ بەم دڵە بەهێز و خۆڕاگرەوە هەڵەکانت ڕاست دەکەیتەوە و دەبیت بە مایەی شانازی و سەربەرزی خێزانت.

پنار کچێکی کامڵ و ئیماندار و بەتوانابوو، وەلێ ڕەشەبای ژیان فڕێی دایە جێیەك کە خۆی نەیدەویست. هەموو چرکەساتێك داخی ئەوە دەیسووتاند...

دەبوو پنار لە شوێنێکدابووایە کە شایستەی ئەوبووایە، بەڵام بەداخەوە وا نەبوو. هەنووکە کچێکی گەنج بوو پاش هەوڵی خۆکوشتن.

هۆكاری هەموو ئەمانەش من بووم. نەفرەتم لە خۆم دەكرد و قێزم لە خۆم دەهاتەوە..

پاش ماوەیەك دەورووبەر هێوربووەوە. من دیسان ئەو بابەتەم هێنایەوە بەر باس كە بیرمی داگیركردبوو:

– كاك ڕەسووڵ، هەمیشە باوەڕم بە خوا هەبووە، بەڵام باوەڕێكی لاواز و بێ كاریگەری بووە. چونكە بەباشی لە چەمكی " خوا " نەگەیشتووم. بۆیە هەموو ژیانم بە سەرپێچیی ئەو بەسەربرد. ئەمڕۆ كە ئاوڕ بۆ ژیانی ڕابردووم دەدەمەوە، بە هەموو بوونم باوەڕم بە بوونی خوایەكی مەزن هەیە. وەلێ ئەمە ناتەواو و خامۆش و بێهێزە. بەتایبەتی بابەتی " قەدەر " هەمیشە كێشەیەكی بیرم بووە. هەرچەندم كردووە لەو مەسەلەیە تێنەگەیشتووم. ئەگەر سەرەتا بەم بابەتە دەست پێبكەین زۆر باش دەبێت. چونكە پێم وایە هەڵەی من لە تێگەیشتنێكی هەڵە لە قەدەرەوە سەرچاوەی گرتووە. ئەگەر خوا بیویستایە قەدەرێكی باشی بۆ دەنووسین؟ بۆچی ئێمەش ناتوانین وەك خەڵك ژیانێكی خۆش بەسەربەرین؟

## وانەیەكی تێروتەسەل سەبارەت بە قەدەر

كاك ڕەسوڵ هاوڕێ لەگەڵ زەردەخەنەیەكی شیریندا دەستی بە قسەكرد:

- ئومێد گیان! تەنها تۆ نیت، کەسانێکی زۆر لە بابەتی قەدەردا خاوەنی زانیاری هەڵە و ناتەواون. لەبەر ئەمە وادەزانن -حاشا- خوا هێزێکی ستەمکارە و بەندەکانی بەرەو خراپە پاڵ پێوە دەنێت.

ساڵانێکی دوور و درێژ کۆمیونیستەکان و بێباوەڕان هەوڵێکی زۆریان دا و پڕوپاگەندەی زۆریان بڵاوکردەوە تا ئەم بابەتە لای خەڵك لێڵ بکەن و بیشێوێنن. ئامانجیان ئەوەیە بیری گەنجانی موسوڵمان بشلەژێنن و لە دین و باوەڕ دووریان بخەنەوە. وەکو دەزانیت ئەو کەسانەی کە زۆرترین تاوان و خراپە ئەنجام دەدەن ئەوانەن کە باوەڕیان لاوازە یان ئیمانیان نییە.

بۆ ئەوەی گەنجێك یان مرۆڤێك بخرێتە سەر ڕێیەکی زیانبەخش و هەڵە، سەرەتا لە ڕێگەی وروژاندنی شەهوەتەوە بۆی دەچن. ئەگەر لەمەدا بۆیان نەچێتە سەر، بابەتە ئیمانییەکانی چەشنی قەدەر و ڕۆژی دوایی و زیندووبوونەوە و ئەو مەسەلانەی کە جاروبار ئەقڵ تیایاندا دەلەنگێت، دەوروژێنن و پاشان پاڵیان پێوە دەنێن بەرەو کوفر و بێباوەڕی .

کاك ڕەسوڵ زۆر ڕاستی دەکرد. کاتێك یەکەم جار ماددەی هۆشبەریان دایە دەستم، ڕازی نەبووم و وتم گوناحە و تاوانە. کەچی ئەو وەڵامەی دایانەوە بیرکردنەوەمی تێکەڵ و پێکەڵ کرد:

"تۆ هێشتا لەکوێدایت کوڕی باش؟ گوناه چییە؟ ئێمە گیانمان دەخەینە مەترسیەوە و پارە پەیدا دەکەین. ئەگەر خوا هەیە - حاشا - با ڕێگایەکی باشی بۆ ئێمە دیاری بکردایە. قەدەرێکی باشی بۆ بنووسیایە و، موحتاجی ئەم چوار فلسە نەبووینایە و، ئێمەش ژیانێکی خۆش

بژیبابینایە. ئەوکات پێویستمان بەم کارە خراپانە نەدەما. بەڵام ئێمەی کردووە بە نەدار و بێنەوا. ئێمەش بۆ ئەوەی نەمانشێلن کەسانی تر دەشێلین. تاوان تاوانی ئێمە نییە، هی ئەو کەسەیە کە ئەم قەدەرەی بۆ نووسیوین" .

کاك ڕەسوڵ کتێبی " وتەکان " ی گرت بە دەستیەوە کە یەکێکە لە بەرگەکانی پەیامەکانی نوور و، دەستی کرد بە خوێندنەوەی بابەتی قەدەر.

نموونەکان و ڕوونکردنەوەکان ئەوەندە جوان و سەرنجڕاکێش و تەواوبوون، حەیفی ئەوەم لێ دەهات کە چۆن تا ئەو ڕۆژە بیرم لەو جۆرە بابەتە نەکردووەتەوە. بەڵام تاوان تەنها هی من و کۆمەڵگا و کەسانی خراپ نەبوو. گەورەترین تاوان هی خێزانەکەم بوو. خێزانەکەم تەنها لە چاویلکەی ماددەوە تەماشای دنیای دەکرد. گرنگی نەدا بە بەها مەعنەوی و ئیمانییەکان. ڕۆژێك پرسیاری کێشە تایبەتییەکانمیان لێ نەکردم. پارەیان نایە باخەڵم و دایانم بەدەم لافاوی ژیانەوە. لە کۆتاییدا گەیشتم بە ئێرە .

دەمەتەقێی سەر سفرەکە زۆری خایاند، وەلێ لە ژیانمدا ئەوە یەکەم جاربوو گوێ لە گفتوگۆیەك بگرم کە فێنکی و ئارامی بە ویژدانم ببەخشێت. جاروبار کە سەیری پنارم دەکرد، دەمبینی ئەویش بە دڵ گوێی گرتووە و نموونە و ڕاڤەکان بیرکردنەوەی ئەویشیان ئاسوودە کردووە.

باش لە بابەتی قەدەر تێگەیشتم. ئێمە بەناوی قەدەرەوە چەند ئەفسانەیەکی پڕوپووچ فێربووبووین کە هیچ پەیوەندییەکی بە قەدەرەوە نەبوو.

### بۆ یەکەمجار شتێکی ڕاست تێگەیشتم

شتێك کە بە دڵنیاییەوە لێی تێگەیشتم ئەمەبوو:

"قەدەر نووسینی ڕەحمەت و داناییە نەك ستەم" !

"زانستی ئەزەلی خوای گەورە بەوەی کە پێشتر دەزانێت ئێمە لە ژیاندا چی دەکەین، ئەمە قەدەری ئێمە پێکدەهێنێت. ئەگینا ئەم زانیارییە پێشینەیە زۆرمان لێ ناکات بۆ ئەنجامدانی. لە تەمەنماندا چەندەها ڕێی جیاواز و هەڵبژاردنی بۆ داناوین. بە زانستی بێسنووری خۆی دەزانێت من کام لەو ڕێیانە هەڵدەبژێرم. ئەمەش ناوی قەدەرە. کەواتە لە کارێکی خراپدا تاوان هی ئەو کەسە نییە کە زانستەکەی هەیە، بەڵکو دەگەڕێتەوە بۆ ئەو کەسەی کە بە ویستی ئازادی خۆی هەڵیدەبژێرێت." [١]

بەڕاستی لێکدانەوەیەکی کامڵ و ڕاڤەیەکی نایاب بوو. ئەگەر خێزانەکەم لەم بابەتە و بابەتە ئیمانییەکانی تردا یارمەتی بدامایە، لەوانەیە نەکەوتمایەتە ئەو هەڵانەوە و ڕۆژم بەمڕۆ نەگەیشتایە .

---

١- بۆ زانیاری زیاتر سەبارەت بە بابەتی قەدەر و جوزئی ئیختیاری خوێنەر دەتوانێت سەردانی وتەی بیست و شەش بکات لە کۆمەڵە پەیامی " وتەکان "، هەروەها کتێبی (قەدەر لە ڕووناکی قورئان و سوننەتدا )ی مامۆستا فتح الله گولەن.

ئاه خێزانەکەم ئاه! هەم خۆتان و هەم منتان کرد بەقوربانی تاوان. هەر لەبەر ئەم هۆیەبوو باوك و دایکم هێزی ماددی و مەعنەوییان لەدەستدا و ئێستا لە خانەی بەساڵاچوواندا بەدوای ئاسوودەییدا دەگەڕێن .

دوای نان خواردن کاتێك ڕوومان لە دارستانە سەوزەکەی بەرامبەرمان کردبوو و قوممان لە چاکانمان دەدا، بۆ یەکەم جار هەستم دەکرد مرۆڤم و مامەڵەی مرۆڤانەم لەگەڵ دەکرێت. کەش و هەوای ئەم ماڵە وەکو دەرمانێکی کاریگەر وابوو کە نەمدەزانی ناوی چییە. دەتووت ئەوە هەوا نییە کە هەڵیدەمژم، بەڵکو خۆراکی ڕۆحییە. خەڵکی دەڵێن کەسێك نییەتی چۆن بێت دەوروبەرەکەشی ئەو ڕەنگە دەگرێت. کەواتە ئەم دوو مرۆڤەی کە بە گشت هەستەکانیان ڕوویان لە خوای گەورە کردووە و داوای چاکەی لێدەکەن، ئەو جێیەی کە ئەوانی لێ دەژین بووبوو بە بەهەشت.

من دیسان داڵغە بردبوومیەوە. بە دەنگی کاك ڕەسوڵ بەئاگا هاتمەوە. بەردەوام بوو لەسەر وتەکانی:

- ئێوە دەناسم، با کەمێکیش بێت. شتێك لە ڕابردووی ئێوە شارەزام، هەرچەندە ئاگام لە وردەکارییەکانی نییە. پشت بەخوا لەمەودوا ئێوەش ئێمە دەناسن. ئەگەر خوای گەورە ویستی لەسەر بێت ئێوە دۆستی تەنها چەند ڕۆژێکی ئێستای ئێمە نین، بەڵکو ئەم دۆستایەتییە تەمەنێك دەخایەنێت. ئەگەر قبووڵی بکەن حەزدەکەین وەکو ڕۆڵەی مەعنەوی ئێمە وابن.

دوای بیستنی ئەو وتە پڕ لە سۆز و میهرەبانییە مـن و پنـار چـاومان چووە سەر یەك و سەرمان داخست. ئەوەش مانای " بەڵێ " بوو. چونکە ئێمەش و ئەوانیش باش دەمانزانی کە هیچ چارەیەکی ترمان نییە...

دوو کەسی بێچـارە و تـەنیابووین کـە تـازە بـە تـازە نەهامەتییـەکانی ژیان هێشتبوویان هەناسەیەك هەڵمژین. چـواردەورمان پڕبـوو لـە دوژمـن، لەبەر ئەمە پێویسـتمان بـە پەناگەیـەك بـوو. کـە ئەمـە حاڵمـان بـوو، ڕازی نــەبوون و ڕەتکردنــەوەی دوو مرۆڤــی فیــداکار و چــاکەکار چ مانایــەکی هەبوو؟!

کاك ڕەسوڵ بەردەوام بوو:

– ئەگەر ڕێگە بدەن دەمەوێت چـەند پرسـیارێکتان لـێ بکـەم سـەبارەت بەوەی چۆن لەم ماڵەدا لەگەڵتان مامەڵە بکەین و بە چی بانگتان بکەین.

## مارەکردنەکەمان نوێ کردەوە

هەردووکمان بە دوودڵی و مەراقەوە سەرمان هەڵبڕی. بەوردی گوێمـان بۆ کاك ڕەسوڵ گرت:

– ئێوە هاوڕێن، دەزگیرانن، یان ژن و مێرد؟

ئـەو پرسـیارە وەکـو بۆمبێـك تەقییـەوە. بـەجارێك تەمـەنی عـومری ڕابردووی پڕ چەرمەسەری بە بەرچاوماندا تێپەڕی. دیسان نـەفرەت و قـین وەکـو ڕەشـەبایەك هـات و سـەر سـنگ و قـوڕگی گـرتین. خـەریك بـوو دەبووراینەوە وەك ئەوەی کەسێك شتێکی قورسی بەسەرماندا کێشابێت.

من پـێش ئـەوەی هـیچ تێبگـەم پنـار لـەوە زیـاتر خـۆی پێڕانـەگیرا و دەستی گرت بە دەموچاویەوە و گریـا. خۆشـترین دانیشـتنی دنیـا لـەناکاو بوو بە تازێباری. کاک ڕەسوڵ و مەدینـەخان زۆر لـەم کاردانەوەیـەی ئێمـە سەریان سووڕما. کاک ڕەسوڵ وتی:

- زۆر داوای لێبووردن دەکەم. دڵنیابن مەبەستێکی خراپم نەبوو.

کاتێك زانیم کاك ڕەسوڵ و خێزانی زۆر دڵتەنگ بوون، نەمویست لـەوە زیاتر ئازاریان بدەین:

- ئێـوە لێمـان ببـوورن. ئـەوەنـدە ڕابردوویـەکی خراپمـان هەیـە هـەموو وشـــەیەك، هـــەموو قســـەیەك و پرســـیارێك، بـــەڵا و ناخۆشـــییەکمان بیردەخاتەوە. من پنارم لە خێزانەکەی خواست. ئەوانیش دایان و تەنانەت مارەشم بڕی. بەڵێنمان دا بە باوکی تا زەماوەند و گواستنەوە، نزیکی یەك نەکەوینەوە. هەرواشمان کرد. سروشتی پنار هەرگیز قبووڵی پێچەوانەکەی نەدەکرد. بەڵام بەداخەوە خوێنڕێژان و ستەمکاران ئەمـەیان بـۆ ئێمـە پـێ زۆربوو.

لەوە زیاتر نەمتوانی بەردەوام بم. پەستانی خوێن هێرشی کردە سـەر کەللەم و ژێریمی لەقکرد. پنار شل بوو و کەوتـە باوەشـی مەدینەخانـەوە. دیاربوو کە دیسان مۆتەکەی ئەو شەوە نەگریسە دڵی گوشـیوە و تـا مـاوە لەبیری ناچێتەوە.

پاش کەمێك کە کەشەکە هێوربووەوە، کاك ڕەسوڵ وتی:

ـ کارەساتی زۆرتان بەسەر هاتووە کە دڵ و جەستەی نەخۆش خستوون. پێویستە لێرە بەدواوە خۆتان کۆبکەنەوە و هەستنە سەر پێی خۆتان. هیچ نەبێت بۆ ڕزگاربوون لەو گوناهانەی دڵی پیس کردوون پێویستتان بەمەیە.

مرۆڤ بە مردن تەنها جەستەی لەناودەبات، بەڵام ئازاری ڕۆح هەر بەردەوامە. ڕاستترین کردەوە ئەوەیە پێش مردن ڕۆح پاك بکرێتەوە لە تاوان. ئێمە تا کۆتایی یارمەتیدەرتان دەبین. ئێوەش دەستی یەك بگرن و هەوڵ بدەن خۆتان لە ڕۆژانی پڕ ئاسۆری ڕابردوو قوتاربکەن.

حەزدەکەم ئەوە بزانن ئێمەش هاووێنەی ئەو ڕووداوە جەرگبڕانەمان بەسەر هاتووە کە ڕووبەڕووی ئێوە بووەتەوە، بەڵام لەوە باش تێگەیشتین کە ڕزگاربوون لەو ڕابردووە بە خۆکوژی نابێت. مردن سادەترین و ئاسانترین ڕێگەیە کە کەسانی لاواز هانای بۆ دەبەن. بەڵام لەڕاستیدا پێویستە ئەو کەسانەی دژایەتی خراپە و تاوانەکان دەکەن لە ژیاندا بمێننەوە و، بەپێوە بوەستن و، لەڕووی ماددی و مەعنەوییەوە بەهێزبن و خەبات بکەن دژی خراپەکاری. بەم شێوەیە یارمەتی ئەوانە بدەن کە لە دوایانەوە دێن و نەهێڵن بکەونە هەمان هەڵەوە، بەمەش هەوڵی سڕینەوەی گوناهە پێشینەکانیان بدەن.

بۆیە دەڵێم با لە سەرەتاوە مارەیی دینیتان نوێ بکەینەوە و ئەمە بکەین بە سەرەتایەك و لاپەڕەیەکی تازە. هەرچەندە ئەمە ئاسان نییە، وەلێ دەبێت ئێمە سەرکەوتوو بین .

چۆنمان دەتوانی ڕەخنە لەو قسە ڕاست و دروستانە بگرین؟ بەڵام پێکهێنانی ژیانێکی نوێ و لەبیرکردنی ڕابردوو، تەنها بە مارەکرانێکی تازە، شتێکی تەواو گران و ئەستەم بوو.

کاك ڕەسووڵ کارەکەی هەر لەوێدا بڕاندەوە و بانگی مامۆستایەکی کرد و لە یەکتری مارەکردین.

## پەرەیەکی نوێمان هەڵدایەوە

ئەو چەند مانگەی سەرەتا دەستپێکێك بوو بۆ ژیانی نوێمان. یارمەتی و هاریکاری لەڕادەبەدەری کاك ڕەسوڵ و خێزانەکەی و، ئەو خۆشەویستی و سۆزەی ئەوان لەڕووماندا نواندیان، بووبوو بە هۆی ئەوەی هێدی هێدی باری سەر شانمان سووك ببێت. ناسینی کەسە نزیکەکانی ئەوانیش ئاسۆیەکی تازەی بەڕووماندا دەکردەوە و، کەشێکی جیاواز و ئارامییەکی ناوازەی بۆ دەستەبەر دەکردین. بەڕاستی ئەم دوو مرۆڤە نموونەییە هەموو هەڵسوکەوتێکیان لە دڵەوە دەکرد و تەنها ئامانجیان ڕەزامەندی خوابوو. بەتایبەتی پەیوەندی خێزانی نێوان کاك ڕەسوڵ و مەدینەخان و ئەو خۆشەویستی و ڕێزەی لە نێوانیاندابوو، سەبارەت بە ئێمە قوتابخانەیەك بوو. یەکێك لەو خاڵە گرنگانەی تر گفتوگۆ شیرینەکانی کاك ڕەسوڵ بوو کە وردە وردە دەیویست فێری خوێندنەوەی کتێبی بەسوودمان بکات، ڕۆژانە بەشێوەیەکی بەردەوام پەیامەکانی نوورمان دەخوێندەوە. پاشان کاك ڕەسوڵ هەڵی دەناین بۆ فێربوون و خوێندنەوەی ژیانی هاوەڵە بەڕێزەکان و دەیووت: " پێویستە هەموو کەسێك، هەموو گەنجێك و گشت

دایکان و باوکان، بەوردی ژیانی هاوەڵە بەڕێزەکان بخوێننـەوە و وانـەی لێ وەربگرن. تا بزانرێت ژیانی ئەوان لە هـەموو ڕوویەکـەوە پـڕە لـە پێـوەر و پێودانگ بۆ ئێمە. ژیانی ئەوان دەرمانە بۆ دەردەداران و ڕێنیشـاندەرە بـۆ ڕێ ونکردووان و دڵنەوایی بەخشە بۆ جەفاکێشان و، چارەسەرە بـۆ گشـت کێشـەکان و، ئـەوان ڕابـەری ڕاسـتەقینەن بـۆ مرۆڤایـەتی. یـەك کەسـی بەویـژدان نابینیتـەوە کـە بـە وردی و جـددی ژیـانی ئـەو کەڵەپیاوانـە بخوێنێتەوە و نەڵێت: "ئەوەی بەدوایدا دەگەڕام دۆزیمەوە." کەواتە یەکەم کارێك کـە دەیکـەین ئەوەیـە ژیـانی ئـەوان دەخوێنینـەوە و دەیکـەین بـە سەرمەشقی خۆمان. ئەوکات دەگەین بەو بەختەوەری و ئاسوودەییەی کـە بە حەسرەتەوە بەدوایدا وێڵین.

من و پناریش بـە گـوڕ و شـەوقەوە ئامۆژگارییـەکانی کـاك ڕەسـوڵمان لەگوێ گرت و کەوتینە خوێندنەوەیەکی چڕوپڕ. بەڕاستی ئـەوەی ئێمـە لـە شوێنی تردا بۆی دەگەڕاین لەوێـدا دۆزیمانـەوە. سـوپاس بـۆ خـوا بـوو بـە چارەسەری گشت کێشەکان و مەرهەمی زاممان.

### چۆن ئەو ڕۆژەم لەیاد دەچێت

یەکەمین و گرنگترین بڕیـاری خۆمـان دا. بـەکوڵ پاڕاینـەوە لـە خـوای گەورە کە تا دوایین هەناسە بەردەوامیمان پێببەخشێت.

پنـار خـۆی داپۆشـی و پێکـەوە بڕیارمـان دا نوێـژەکانمان بکـەین. بەڕاستی ئەوەندە خۆش و بەلەزەت بوو، گەر بۆ چـەند چرکەسـاتێکی لـەو جۆرە، تەمەنێکیش فیدا بکرێت هێشتا هەر کەمە!

ئەم بڕیارە کتوپڕەی ئێمە هێندە کاك ڕەسوڵ و مەدینەخانی دڵخۆش کرد بڕیاریاندا ئێوارەی ئەو ڕۆژە سفرە بڕازێننەوە و بەو بۆنەیەوە پیرۆزباییمان لێ بکەن.

## ئەو گومانانەی زەین گیرۆدە دەکەن

بەربەستێکی گەورە لە ڕێماندا هەبوو. هەرچەندم دەکرد ئەو گوناهانەی ئەنجاممان دابوون و، ئەو چڵکنییەی ناخمان و، وەسوەسەکانی شەیتان، پێکەوە نەیاندەهێشت ئامێکی ڕەحەت هەڵکێشین. لەبەر ئەمە یەکەم نوێژ بەخۆداچوونەوەیەکی زۆر جددی بوو. چونکە گومان و وەسوەسەی ناو دڵم هەموو جۆرە ئاستەنگێکی دروست دەکرد لەپێناو دوورخستنەوەی من لە سوژدەبردن .

پێکەوە لەگەڵ پناردا دەربارەی ئەو وەسوەسە و خەیاڵاتانە پرسیارمان کرد کە لە نوێژدا مرۆڤ گیرۆدە دەکەن.

کاك ڕەسوڵ پەیامەکانی نووری گرت بەدەستیەوە و، ئەو شوێنەی خوێندەوە کە تایبەتە بەم پرسیارە. دڵم ئاوی خواردەوە و ئاسوودەبووم بەو ڕوونکردنەوە جوان و ناوازەیە.

پاشان بەدەم چا خواردنەوەوە کاك ڕەسوڵ باسێکی زۆر سەرنجڕاکێشی لەسەر نوێژ خوێندەوە. ئەوەندە جوان بوو بە جارێك تێرم نەخوارد. دواتر خۆم سێ چوار جاری ترم خوێندەوە. بە نموونەیەکی نایاب نوێژی ڕوون دەکردەوە:

"ئەگەر دەتـەوێت ڕادەی بـەها و گرنگیـی نوێـژت بـۆ دەربکـەوێت و، بزانیـت چ دەسـتکەوتێکی گەورەیـە و، چـۆن مـرۆڤ ئـەم دەسـتکەوتەی بەئاسانی دەستگیر دەبێت ..

هـەروەها ئەگـەر دەتـەوێت گێلـی و تێنەگەیشتنی ئـەو کەسـەت بـۆ دەربکەوێت کە ئەم پەرستشە ئـەنجام نـادات و، بزانیـت چـەندە مرۆڤێکـی زەرەرمەندە..

بەڵێ، ئەگەر حەزدەکەیت ئەمانە بزانیت و بەئەنـدازەی ( دوو کـەڕەت دوو دەکاتە چوار ) لێی دڵنیا ببیت، ئەوا سەرنج لەم چیرۆکە کورتە بـدە و لێی وردبەرەوە:

جارێکیــان فەرمانڕەوایــەکی گــەورە دوو خزمــەتگوزای خــۆی بــۆ باخچەیەکی تایبەتی جوان و دڵڕفێن نارد کە دوو مانگ ڕێ دووربوو، یـەکی بیسـت و چـوار لـیرەی زێڕیشـی دانـێ تـاکو پێـی بگەنـە مەزراکـە و لـەوێ نیشتەجێ بن و، پێی وتن :

( بلیت و پێداویستییەکانی گەشتەکەتان و پێداویستییەکانی ناومـاڵ و نیشــتەجێبوونتان، بــەم پارەیــە بکــڕن.. دوای ڕۆژە ڕێیــەکیش دەگەنــە وێستگەیەك کە هەموو هۆکارەکانی گواسـتنەوەی تێدایـە لـە ئۆتۆمبیـل و، فڕۆکـە و، شـەمەندەفەر و، پـاپۆڕ.. نرخـی سـواربوونی هـەرکام لەمانـەش لەوی تر جیایە و بەپێی سەرمایەی ئەوکەسەیە کە سواری دەبێت).

ئـەوانیش دوای وەرگرتنــی ئــەم دەرس و ئامۆژگارییانــە، کەوتنــەڕێ. یەکێکیان لەبەر ئەوەی مرۆڤێکی بەختەوەر و شادمان و ژیربـوو، بەشـێکی

پارەکەی بەجۆرێك فەرمانڕەوا پێی ڕازی بێت، خستە کار و کەسابەتەوە تا گەیشتە وێستگەکە و، سوود و قازانجێکی زۆری لێ دەست کەوت بەچەشنێك کە سەرمایەکەی یەك بۆ هەزار زیادی کرد .

بەڵام ئەوی تریان لەبەر ئەوەی هەرزە و بەدبەخت بوو، تا گەیشتە هەمان جێ، بیست و سێ لیرەی بە قومار و هەڵەخەرجی بەزایەدا و تەنها یەکێکی پێ مایەوە !

لەبەر ئەوە، هاوڕێکەی پێی وت:

کاکی خۆم! ئەم لیرەیەی ئێستا پێت ماوە بلیتی سەفەری پێ بکڕە و بەخۆڕایی لە دەستی مەدە، بۆ ئەوەی لەم ڕێگا دوور و درێژەدا بە برسێتی و ئاوارەیی نەمێنیتەوە. فەرمانڕەوای گەورەشمان تا بڵێی لێبووردە و جوانمەردە، بەڵکو لە کەموکوڕییەکانت خۆش ببێت و تۆش سواری فڕۆکە بکات و پێکەوە لە ماوەی ڕۆژێکدا بگەینە جێی خۆمان. خۆ ئەگەر بەگوێیشم نەکەیت، ئەوا ناچار دەبیت کە بەپێ بکەویتە ڕێ و بە دوو مانگی ڕەبەق و بەبرسێتی و نامۆیی و تەنیایی ئینجا بیبڕیت و بگەیتە جێ.

جا ئەگەر ئەم هاوڕێیە سەرپێچی نواند و، بەو تاکە لیرەیەی پێی ماوە بلیتەکەی نەکڕی ـ کە وەك کلیلی دەرگای گەنجینەیەك وایە ـ بەڵکو لە پێناوی حەز و چێژێکی سەرپێیی دا بەکاری هێنا، ئایا نەزانترین مرۆڤیش تێناگات کە ئەو کەسە چەندە بەدبەخت و زەرەرمەند و گێژ و گەلحۆیە ؟

ئەی ئەو کەسەی کە نوێژ ناکات!

هەروەها ئەی دەروونی خۆیشم کە حەزت لە نوێژ نییە و پێت ناخۆشە!

مەبەست لەو فەرمانڕەوایە: خوای پەروەردگار و بەدیهێنەرمانە..

دوو خزمەتگوزارەکەش: یەکێکیان ئەو کەسەیە کە ڕێی ئایینی گرتووەتە بەر و، زۆر بەپەرۆشی و تاسەوە نوێژەکانی دەکات.. مەبەست لەوی تریشیان ئەو مرۆڤە بێئاگایانەیە کە وازیان لە نوێژکردن هێناوە..

بیست و چوار لیرەکەش، بیرتییە لەو بیست و چوار کاتژمێرەی شەو و ڕۆژ کە تەمەنی مرۆڤیان لێ پێکدێت..

باخچە تایبەتی و جوانەکەش بریتییە لە بەهەشتی بەرین..

مەبەست لە وێستگەکەیش گۆڕی مرۆڤە، کە لێیەوە دەڕوات بۆ جیهانێکی تر..

گەشت و سەفەرەکەش، ئەو گەشتەیە کە مرۆڤ لە سەرەتای لەدایکبوونیەوە دەستی پێدەکات و بە دەرگای گۆڕدا تێدەپەڕێت تا دەگاتە ئەو دنیای هەمیشەیی و، ئنجا لەوێ کۆتایی بە گەشتەکەی دەهێنێت.

ئەوانەش بەم ڕێگایەدا گوزەردەکەن بەش بەشن، هەر بەشەی بەپێی پایەی کردەوەکانی خۆی پلەی بۆ دانراوە: هەندێك لەو خواپەرستانە وەك هەورەبروسکە ماوەی هەزار ساڵ بە یەك ڕۆژ دەبڕن و، هەندێکی تریان - وەك خەیاڵ - لە یەك ڕۆژدا ماوەی پەنجا هەزار ساڵ دەبڕن، وەك قورئانی پیرۆز لە دوو ئایەتدا ئاماژەی بەم ڕاستییە داوە..

مەبەست لەو بلیتەش ( نوێژ )ە..

لە ڕاستیدا تەنها یەك كاتژمێر لەو بیست و چوار كاتژمێرە سەروزیادە بۆ نوێژ و دەستنوێژی ماوەی ئەو شەو و ڕۆژە.

ئایا ئەو كەسەی كە بیست و سێ سەعاتی شەو و ڕۆژ بۆ ئەم دنیا زۆر كورت و كەمخایەنە سەرف دەكات و، تاقە كاتژمێرێكی بۆ ژیانی نەبڕاوەی هەمیشەیی تەرخان ناكات، چەندە ستەم لە خۆی و كارێكی دوور لە ژیری دەكات؟!

بەڵێ، ئەگەر خەرج كردنی نیوەی سامان لە قومارێكی وەك "یانسیب" دا، كە هەزار كەس بەشداری تێدا دەكەن، بەلای هەندێكەوە بە كارێكی ژیرانە بژمێررێ، كە ڕێژە و گریمانی بردنەوەشی یەك لە هەزارە، ئەی ئەو كەسەی كە یەك لە بیست و چواری سامانی خۆی لە قازانجێكی گومان لێ نەكراودا و لە دەستكەوتنی گەنجینەیەكی هەمیشەییدا بەشدار ناكات - كە ڕێژەی قازانجی لە سەدا نەوەد و نۆیە - كارەكەی پێچەوانەی ژیری و دژی دانایی نییە؟ ئایا هەركەسێك خۆی بە ژیر و تێگەیشتوو بزانێت لەمە تێناگات؟!

لە هەمان كاتیشدا نوێژكردن، خۆی لە خۆیدا، حەسانەوەیەكی تا بڵێی گەورە بە " گیان " و " دڵ " و " ژیری " ی مرۆڤ دەبەخشێت. جگەلەوەش كارێكی قورس و مایەی بێزاری نییە بۆ " جەستە " ی مرۆڤ. سەرەڕای هەموو ئەمانەش، ئەو كەسەی نوێژەكانی بەجێ دەهێنێت،

بەهۆی نیازی پاك و خاوێنەوە، هەموو كار و كۆششێكی حەڵاڵی تری بۆ دەبێت بە پەرستش و، بە خواپەرستی بۆی دەنووسرێت.

بەم چەشنە، مرۆڤی نوێژكەر دەتوانێت هەموو سەرمایەی تەمەنی بەرەو ئاخیرەت بەرێ بكات و، بە تەمەنە كورت و فانییەكەی دنیای، تەمەنێكی هەمیشەیی لە دوارۆژدا بەدەست بهێنێت ".[1]

**قوتابخانەی ژیانمان تازە دەستی پێدەكرد**

كاك ڕەسوڵ دكتۆر و، خێزانەكەیشی مامۆستابوو. بەیانیان زوو هەڵدەستان بۆ نوێژ. پاشان بەوپەڕی خشوعەوە ویردەكانی دوای نوێژیان دەخوێند. ئنجا بەدوایدا كاك ڕەسوڵ تەفسیری قورئانی پیرۆزی بۆ دەخوێندینەوە و ڕاڤەی دەكرد بۆمان. من و پنار ئەوەندە ئالوودەی ئەو وانەی بەیانیانە بووبووین، بە تامەزرۆییەوە چاوەڕوانی بووین .

پاشان كاك ڕەسووڵ و خێزانی دەچوون بۆ سەر كار و ئێمەش لەماڵەوە كتێبەكانمان دەگرت بە دەستمانەوە و وەك ئەوەی خەزێنەیەكمان دۆزیبێتەوە، بەدڵ دەمانخوێندەوە و ناتەواوییەكانمان پێ پڕدەكردەوە. بێگومان نوێژەكانیشمان بەوپەڕی لێبڕانەوە دەكرد. هەموو نوێژێك تام و چێژێكی جیاوازی پێدەبەخشین. بەڵام هەردەم گومانی " بڵێی خوا لێمان

---

١- دەقی كوردی ئەم پارچەیە لە وەرگێڕانەكەی مامۆستا فارووق ڕەسوڵ یەحیاوە وەرگیراوە. بڕوانە: وتەكان، لا ١٧ ـ ٢٠

خۆش ببێت؟ " هاوڕێمان بوو. بەتایبەتی پنار کە هەستیار و دڵناسك بوو، هەمیشە چاوی بەگریان بوو.

ئەو شەوەش دیسان شەوێکی لەڕادەبەدەر قەشەنگ بوو. ئەو کۆڕ و دەرسە هەفتانەیەی کە ڕێکدەخرا و، کەشێکی جوانی مەعنەوی دەسازاند و، دەیبردینە دنیایەکی خەیاڵی کە هەرگیز دەستی ئازار وخەفەتی پێنەگات. ئەو شەوە پیرۆزە تەواو بۆ ئێمە وەك میوانداریيەکی ڕەنگاوڕەنگ وابوو، چونکە ڕۆح و دڵ و دەروونمان باڵی دەگرت و، ژیری و دڵمان ئاوی سازگاری دەنۆشی و، کێشە دەروونی و هزرییەکانمان وەڵامی خۆیان وەردەگرت.

ئەو شەوە کەسانێکی زۆر و هەمەچەشنە هاتبوون بۆ دەرسەکە. ئەو شەوە هیوام گوڵی تازەی گرت و بڕوام بە داهاتوو زیادی کرد. چەندین پرسیار کە مێشکمیان ئاڵۆز و گیرۆدە کردبوو، ئەو شەوە وەڵامی خۆیان دەست کەوت. ئیتر چۆن دەکرێت مرۆڤ لەو جۆرە کۆڕ و کۆبوونەوانەدا دڵی خۆش نەبێت و بەرەو ئاسمانی بەختەوەری پەرواز نەکات؟

جگە لە سوپاس کردن چیمان لە دەست دەهات؟

"خوایە گیان! ئێمە لەم هەوا مەعنەوی و کەشە پڕ ڕاز و نیازە دامەبڕە! ئەو جوانییانەی کە دڵمانت لێ پڕکردووە بە زۆریان مەبینە! ئەگەر ئەم بەختەوەرییەم لە خەودا ببینییایە هەرگیز باوەڕم نەدەکرد. هەرچەند ئێمە شایانی ئەمانە نین، بەڵام ڕەحم و لوتفی تۆش بێئەندازەیە."

ئەو شەوە کە بۆ نووستن چووم بۆ ژوورەکەم بینیم بۆ یەکەم جار چاوەکانی پنار پێدەکەنن. کەواتە پنار لە من زیاتر سوودی وەرگرتووە و چارەی زامی خۆی پێکردووە .

هەموو شتێك کەوتبووە سەر ڕێی خۆی. هەموو ڕۆژ و هەموو ساتێك لە جەژندابووین و ، دەمانوت: "زۆر سوپاس بۆ تۆ خوایەگیان، ئێمەت ڕزگارکرد"!

ئێوارەیەك کاك ڕەسووڵ بەدەم پێکەنینەوە گەڕایەوە:

ـ سەرێکم لە ئاسایش دا. بەپێی ئەم یاسا نوێیەی کە دەرچووە لەو تاوانەتان خۆشبوون کە تێوەی گلاون. بەیانی دەچین ئەو کارە ڕەسمییانەی کە پێویستن دەیکەین. واتە هەنووکە ئێوە بەفەرمی بێتاوانن. بەڵام سەرەڕای ئەمەش لەبەر دڵنیایی خۆمان، پێناسی تازەتان بۆ دەردەکەین و ماڵەکەشمان دەگوازینەوە. واتە ناوی تازە و ماڵی تازە و ژینگەیەکی تازە... ئەوەی لە دەست ئێمەبێت دەیکەین، ئیتر ئەوەی تری حەواڵەی خوا دەکەین.

کاك ڕەسوڵ و خێزانی وەك چاوی خۆیان ئێمەیان دەپاراست و ئەو ڕێوڕەسمە فەرمییانەی کە پێویستبوون یەك یەك دەیانگرتە بەر. خوای گەورە هەزاران جار لێیان ڕازی بێت.

کاتێك وردە وردە پنار لەڕووی جەستەیی و ڕۆحییەوە باشتر دەبوو، بیری لەوە دەکردەوە چۆن هەموو ئەمانە بە خێزانەکەی ڕابگەیەنێت. پاش ئەو ڕووداوە جەرگبڕانەی ڕابردوو خۆی بە مردوویەك لەقەڵەم دابوو و

هەموو پەیوەندییەکی لەگەڵ خێزانەکەی پچڕیبوو. نەیویست پاش ئەو کارەساتە قێزەونانە بچێتە بەردەم خێزانەکەی و ببێت بەهۆی شەرمەزاری و ڕووزەردییان. وەلێ پاش ئەوەی ژیان هێدی هێدی باری ڕاست بووەوە، بە مێشکی هێمن و لەسەرخۆ دیسان بیری لێکردەوە. بەجۆرێك لەو دواییانەدا زوو زوو ئەم بابەتانەی لەگەڵ دەکردمەوە .

شەوێکیان لەوانەیە بەو خەیاڵەوە نووستبێت، بۆیە بەیانی کە هەستاین بۆ نوێژ دیسان سەری قسەی کردەوە:

– چی بکەین؟ هەواڵیان بۆ بنێرین و بڵێین کچەکەت مردووە و دەستی لێ بشۆ، یان ڕێگایەکی تر بدۆزینەوە؟

لەڕاستیدا بەناچاری ئەوەی پێشنیازکرد و خۆشی بەدڵی نەبوو. چونکە بۆ هەمیشەیی خێزانەکەی تووشی ئازار و تازیەباری دەکرد. وەلێ بەپێچەوانەوە هەواڵی " دەژی، بەڵام تووشی ڕێی خراپ هاتووە " زیاتر ئەوانی خەمبار دەکرد.

من کێشەیەکی لەم جۆرەم نەبوو، چونکە هیچ پەیوەندییەکم بە خێزانمەوە نەمابوو. کەسیشم نەبوو بەدوامدا بگەڕێت. تاقە باوکێکم هەبوو ئەویش لە خانەیەکی ساردوسڕی بەساڵاچوواندا کۆتا ڕۆژەکانی ژیانی بەسەردەبرد. هەر ساڵانێکی زۆر لەمەوبەریشەوە پەیوەندیم پێیەوە نەمابوو.

بە یارمەتی کاك ڕەسوڵ ڕێگەچارەیەکمان بۆ ئەم کێشەیە دۆزییەوە کە ماوەیەك بوو بیری پناری خەریك کردبوو. وتی:

- هەردوو هەواڵی "مردن" یان "ژیانێکی خراپ" خێزانەکەت ئازاردەدات. پێویستە بە هەر نرخێك بووە بچیتەوە بەردەرگای خێزانت. بۆ نموونە پاساوی نەخۆشی بهێنەرەوە بۆ ئەوەی کە تا ئێستا نەتتوانیوە سەردانیان بکەیت. ئێمەش لەلای خۆمانەوە یارمەتیتان دەدەین. بڕۆنەوە بۆ شاری خۆتان، تەنانەت ئەگەر گونجاوبوو زەماوەندێك سازبکەن. دواتر دەتوانن بۆ کارکردن بگەڕێنەوە بۆ ئێرە. ئێمە ئامادەین لەگەڵ خێزانت قسەبکەین و تێیانبگەیەنین. پاشان کە گەڕانەوە پێکەوە نەخشەیەك بۆ ژیانی داهاتووتان دادەڕێژین. خەمتان نەبێت، خوای گەورە پشتی هەموو نیەتێکی باش دەگرێت و یارمەتی هەموو بەندەیەکی ڕاستگۆ و دڵسۆز دەدات. هەرگیز لە نیوەی ڕێدا بەجێتان ناهێڵێت.

## گەشتێکی پڕ غەم

به هاریکاری ئەم دوو مرۆڤە فیداکارە بێوێنەیە چووین بۆ خزمەتی دایك و باوکی پنار. ئەم گەشتە بۆ هەردووکمان ئەو خەم و ژانەبوو کە مرۆڤ لە ساتی ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ تاوانەکانیدا هەستی پێدەکات. بە ترس و لەرز و شەرمەوە ڕۆیشتین. بەتایبەتی پنار بە ساغی لە شاری خۆی دەرچووبوو، بەڵام وا ئێستا بە قاچێکی بڕاوەوە دەگەڕێتەوە و چەند پەنجەیەکی دەستی ڕاستیشی نییە. ئەمەش تابلۆیەکی ئازاربەخش بوو. خوا لە کاك ڕەسوڵ و خێزانی و کاك ئەحمەد ڕازی بێت، لەو ڕۆژە تەنگانەدا بە تەنیا جێیان نەهێشتین. ئەوانیش لەو گەشتەدا هاوڕێیەتییان کردین.

ئیتر ناوی من ڕەسووڵ و ناوی پناریش مەدینەبوو. نەماندەتوانی ناوی تر هەڵبژێرین. هەڵگرتنی ناوی ئەم دوو کەسەی کە وەك باوك و دایکی ڕاستەقینە باوەشی سۆز و میهرەبانییان بۆ کردینەوە، شەرەفێکی گەورەبوو. ئیتر لەمەوداو من ڕەسوڵی بچووك و پناریش مەدینەی گچکەبوو .

ئەم جوانی و خۆشییانە وەك خەونێك دەهاتنە پێش چاومان و هەمیشە ترسێك لە دڵماندا خۆی مەڵاس دابوو. دەلەرزاین و دەترساین لەوەی هەموو ساتێك دەگونجێت ئەو خەوە تەواوببێت و ئەو دنیایەش ئاوەژوو ببێتەوە .

# بەشی هەشتەم



## تاقیکردنەوەکانمان دوایی نەدەهات

زۆر بە کەمی دەچووینە دەرەوە. بۆ ئەوەی بەرچاو نەکەوین لە حاڵەتی زۆر پێویستدا نەبووایە ماڵەوەمان جێنەدەهێشت. بەڵام ڕۆژێکیان ناچاربووم لەگەڵ کاک ڕەسوڵ بڕۆم چونکە خانوویەکی تازەمان گرتبوو و دەبوو منیش ئامادەبم. چووین بۆ ئەو گەڕەکەی ماڵەکەی لێبوو. پێویستبوو ئەنجومەنی گەڕەك بدۆزینەوە. پێیان وتین مزگەوتی گەڕەك نۆژەن دەکرێتەوە و ئەنجومەنیش لەوێ خەریکی کارە. چووین بۆ مزگەوتەکە و پرسیاری ئەنجومەنمان لە کرێکارێك کرد. ئەویش پەنجەی بۆ پیاوێکی کەڵەگەت ڕاکێشا کە کڵاوێکی سپیی پاکی لەسەردابوو و، وتی:

- ئەو دەزانێت، لە ئەو بپرسن.

لەو پیاوە نزیك بووینەوە. بە دەستی بلۆکی دەگواستەوە. پێمان وت:

- بەشوێن ئەنجومەندا دەگەڕێین، دەزانیت لەکوێیە؟

پیاوەکە بلۆکەکەی دەستی دانا و بەوردی لێی ڕوانیم. دەتووت لەو چاوانەوە تەزوویەکی سەیر و سەمەرە دەهاتە ناو جەستەمەوە. لەژێر لێوەوە وتم: " ئای خوایەگیان! ئەمە دەبێت خۆی بێت! بەڵێ، ئەو."...

هاوارم کرد:

ـ بابە! بابە ئەوە تۆیت؟

باوەشم پێداکرد، وەك یەکێك کە دوای چەندین ساڵ سەروەتێکی بەنرخی ونبووی دۆزیوەتەوە .

لەپێشدا دوودڵ بوو. پاشان دەتووت تازە لە خەو ڕاپەڕیوە. لە خۆشیدا نەیدەزانی چی بڵێت، چونکە لە کاتێکدا منی دیتبووەوە کە هەرگیز چاوەڕێی نەدەکرد .

ـ کوڕم!.. ئومێد گیان! ئەوە تۆ دەژیت؟

باوك و کوڕ توند باوەشمان کرد بەیەکدا، وەك ئەوەی بمانەوێت بە چرکەساتێك خەمی چەند ساڵەی دووری لەبیربەرینەوە .

هەرچەندە نە ئەو باوکایەتی بۆ من کرد و نە منیش کوڕێکی باش بووم بۆ ئەو، بەڵام دیسانیش من قەرزی باوکایەتی ئەوم لە ئەستۆدابوو.

کاك ڕەسوڵ بە سەرسامییەوە لەم دیمەنەی دەڕوانی و، قۆڵی هەردووکمانی گرت و، بردینی بۆ شوێنێکی ئارامتر. لە چایخانەیەك لەو نزیکانە دانیشتین. چامان دەخواردەوە و لاپەڕەی دەفتەری کۆنمان هەڵدەدایەوە و، یەك یەك ڕووداوە ئازاربەخشەکانی ڕابردوومان چاو پیادا دەخشاندەوە. من پێویست بوو تابلۆیەکی جوانی ژیانی خێزانی خۆم و

پنار بۆ باوکم وێنابکەم. باوکیشم باسی سەرگوزەشتەی خۆی کرد. ژیانی پڕ لە هەوراز و نشێو، پڕ لە هەڵکشان و داکشان... وتی:

ــ ئێستا لە خانەی بەساڵاچووان دەمێنمەوە. سوپاس بۆ خوا خزمەتگوزارێکی ئەو خانەیە بوو بە فریادڕەسم. سوپاس بۆ خوا سەرلەنوێ خۆمم دۆزییەوە و ئیمانم هێنا. نازانم چۆن قەرەبووی تەمەنێك دەکرێتەوە کە بە تاوان بەڕێ کرابێت. ناشزانم ئەم پەشیمانییە چ سوودێکی دەبێت. ژیانم بە شێوەیەکی سەیر بوو بە قوربانی نەفس و شەیتان و کەسانی دووڕوو کە لە شەیتان خراپترن و، بەخۆڕایی لە دەستم چوو. بۆیە نە خێرێکم بۆ خۆم بوو، نە بۆ خێزانەکەم. خێزانی دەوڵەمەند و ناودارمان وەك سەهۆڵ توایەوە و چەشنی ئاویش بوو بە هەڵم...

ڕۆژانم لە خانەی بەساڵاچوواندا بەسەردەبەم. هەوڵ دەدەم هیچ نەبێت لەم چەند ڕۆژەی کۆتایی تەمەنمدا بەندایەتی بەجێبهێنم. هەفتەی سێ ڕۆژ دێم بۆ ئێرە و لەگەڵ کرێکارەکان کار دەکەم. پارەیەکی زۆر کەمم دەدەنێ. هەر بەشی کرێی پاسەکەم دەکات .

بە دوور و درێژی لەگەڵ باوکم دەردەدڵمان کرد. هەردووکمان زۆر خۆشحاڵ بووین. تۆبەکردن و ئەوەی ئەو دەستی کردووە بەنوێژکردن، منی زۆر دڵخۆش کرد، هەروەها شێوازی ژیانی منیش ئەوی خۆشحاڵ کرد.

ئەو ڕۆژە ڕۆژێکی زۆر خۆش بوو. بەڵام ئیتر ئەمە ژیانە، هیچ شتێکی تا سەر نەبوو. هێشتا تاقیکردنەوەی سەختی ژیان تەواو نەبووبوو. بەچیدا بمزانیایە ئەو ڕۆژەی کە بەو جوانییە دەستی پێکرد بە تراژیدیا کۆتایی

دێت؟ وەلێ چۆن تراژیدیایەك؟ لەوانەیە تا ئەمڕۆ ئەوە سەختترین و ناخۆشترین ڕووداوبێت کە بەسەرم هاتووە.

ڕێك لەو کاتەدا کە هەستاین بۆ ڕۆیشتن، دوو پیاوی چەك بەدەست لە دەرگای چایخانەکەوە دەرکەوتن. بەدەم جوێن و هات و هاوارەوە ڕووی هەموومانیان لە دیوارەکە کرد و گیرفانیان پشکنین. پاشان یەکێکیان وتی:

- ئومێد تۆیت، ها؟ واتزانی دەتوانی لە ئێمە هەڵبێیت و ڕزگارت ببێت؟ خۆت چاك دەزانیت ئێمە چاودێری هەناسەکێشانیشت دەکەین .

- نەخێر، من ئومێد نیم، ناوم ڕەسوڵە. ئەگەر دەتانەوێت سەیری پێناسەکەم بکەن.

- ئەوەی تۆ پێی دەڵێیت پێناس تەنها پارچەیەك کاغەزە، بەنیازیت بەوە بمانخەڵەتێنیت؟ ئێمە دەزانین لە کوێ و چۆنیش ئەو پێناسەت وەرگرتووە.

باوکم چەند جارێك پاڕایەوە و، چووە بەردەمیان و، ویستی بمپارێزێت:

- مەکەن بۆ خاتری خوا! ئەو چی لە ئێوە کردووە؟

یەکێکیان بە قۆناغی دەمانچەکەی کێشای بەسەری باوکمدا و قیڕاندی:

- لاچۆ لەبەر چاوم پیرەمێردا

باوکم تەختی زەوی بوو. پێش ئەوەی من بگەمە لای باوکم و هەڵیبستێنم دەنگی فیشەك هات. لە سەر و لە پشتمدا هەستم بە ئازارێکی سووتێنەر کرد. بۆ ساتێك چاوم ڕێشکە و پێشکەی کرد، بۆ ئەوەی نەکەوم دەستم بۆ ڕاست و چەپ درێژکرد. ئیتر دوای ئەوەم بیرنایەت.

## دیسان نەخۆشخانە

دیسان چاوم لە نەخۆشخانە کردەوە. بریا نەمکردایەتەوە. خۆزگە هەر لەوێدا تەمەنم تەواوببووایە. خۆزگە خوای گەورە لەم دنیایە دەیبردمەوە و لەم ئازارانە ڕزگارم دەبوو، بەڵام ئەوە ئاسان نەبوو. دیاربوو پێویستە ڕەنجی زیاتر بکێشم و ڕۆژانی سەختتر ببینم.

ڕەشۆی گەردوون بەدەستی ئەوەوەیە و هەموو کارێکی دانایی تێدایە. لەنێو ئازاری لەسنووربەدەردا بیرم لەمە دەکردەوە و دەمویست ڕاڤەیەکی گونجاو بۆ ڕووداوەکان بکەم .

یەکێك لە گوللەکان بەر کەللەم کەوتووە، بەڵام زیانی بە مێشکم نەگەیاندووە. بە نەشتەرگەری دەریان هێنا. وەلێ ئەوی تریان کاری خۆی کردووە...

کاتێك هاتمەوە هۆشی خۆم بینیم لە خوار کەمەرمەوە هەست بە هیچ ناکەم. وەختێك تێگەیشتم ئەوە مانای چییە، دنیام دیسان ڕووخا و، هیواکانم با بردنی و، ژیانم سەرەوژێر بووەوە .

گوللەی دووەم بەر دڕکەپەتکم کەتبوو. لە ناوك بەرەو خوار ئیفلیج بووم .

نەمدەتوانی بڵێم: " خوایە ئەمەت بۆچی پێدام؟ ". مافی ئەوەشم نەبوو بڵێم: " من بۆچی شایانی ئەمەبووم؟"

چونکە تێگەیشتم کە گۆزە هەر لە رێی کانی دەرژێت...

ئەو هەموو گوناهە ناشیرینەی تێوەی گلام و، ئەو هەموو گەنجە داماوەی بە ماددەی هۆشبەر ژەهراویم کردن و، ئەو هەموو لانەیەی من بووم بە هۆکاری تێکچوونیان، بێگومان دەیگەیاندم بەم سەرەنجامە. ئاهی ستەملێکراو عەرشی خوا دەهەژێنێت. بە چاوی خۆم ئەوەم بینی .

لە کاتێکدا کە وردە وردە هاتبوومەوە سەر خۆم و خەریك بوو هیوایەکم بۆ دوارۆژ تێدا دەبووژایەوە، ئەم کارەساتە نەگریسە هات و سەرجەم خەیاڵەکانمی وەراند. ئیتر لێرە بەدواوە بەرگرییەکی بێهیوایانەم دەکرد.

ئەی مەدینەی بچووك؟ ئاە، هاوسەرە داماوەکەم! چەند بێبەخت و هەژارە. رۆژێك نەمتوانی ژیانێکی خۆشی بۆ فەراهەم بهێنم و، جارێك پێبکەنێ. ئێستا دەبوو حاڵی ئەو چۆن بێت؟ چۆن بەرگەی نەخۆشیێکی دەگرت کە تا کۆتایی ژیانی مەحکومی عەرەبانەیە؟ چۆن تەمەنی لاوێتی خۆی دەکرد بە فیدای من؟ سەرەڕای ئەوەی خۆشی قاچێکی نییە...

هەموو شتێك تێکەڵ و پێکەڵ بووبوو، هەموو شتێك لێڵ و سەرەوژێربوو. بەتایبەتی کاتێك هەواڵی مەرگی باوکمیان پێدام ئەوەندەی تر ژیانم وێران بوو .

باوکم کە بەدرێژایی تەمەنی سۆز و خۆشەویستی لەڕوودا نەنواندبووم، لەوانەیە ویستبێتی بە پارێزگاریکردن لە من حەقی ئەوە بکاتەوە. لە کاتی تەقەکەدا خۆی داوەتە بەر من و بە دەستی ئەو ناپیاوانە گیانی دەرچووە. ئەمەش حیکمەتێکی تر و نهێنییەکی تری کارەکانی خوای گەورە بوو. هیچ نەبێت ئەو چەند ڕۆژەی کۆتایی تەمەنی بە بەندایەتی بەسەربردبوو. کەس لە خوا نائومێد نابێت. ئیشەڵڵا ڕزگاری بووە .

پاش چارەسەری نەخۆشخانە بە یارمەتی کاك ڕەسوڵ و خێزانی هێنایانمەوە بۆ ماڵە تازەکەم.

## فیداکارییەکانی مەدینەی بچووك

مەدینەی بچووك ڕۆژ تا ئێوارە بەژوور سەرمەوەبوو. چەشنی پەرستیارێکی هێمن و دڵسۆز هەموو جۆرە خزمەتێکی دەکردم. بەڵام ئەمە زۆر منی بێتاقەت کردبوو.

مەدینەی بچووك کە شەوان تا بەیانی لەتاو ئازاری گورچیلەکانی خەو بەدەچووە چاوی، بۆ ئەوەی من خەفەت نەخۆم لە منی دەشاردەوە و نەیدەهێشت هەستی پێبکەم. وەلێ من ئەوەم دەزانی و خەریك بوو شێتی دەکردم. ڕۆژێك خۆم پێ نەگیرا و مەدینەی بچووکم لە بەرامبەرم دانیشاند و ئەم بابەتەم کردەوە. لە چاوە پڕ سۆز و خەمەکەیم ڕوانی و، وتم:

- نازانم لە کوێوە دەست پێبکەم. ئەگەر لەگەڵ تۆدا ئەم باسە نەکەمەوە دڵم ئاو ناخواتەوە .

لەناكاو پەڵەهەور بەری نیگا جوان و شیرینەكانی گرت و بێتاقەت بوو.

بەپەلە وتی:

- شتێك هەیە و من نایزانم؟

- بەڵێ، كێشەیەكم هەیە نایزانیت و حەزدەكەم بیزانیت. هەموو ڕۆژێك زیاتر دەبێت و ئازارم دەدات.

زۆر سەری سووڕما. ڕوخساری ئەسمەری سوور داهاتبوو.

بەردەوام بووم:

- سەیركە مەدینە، لەگەڵ مندا ژیانێكی زۆر گرانت هەڵبژارد كە هیچ كچێكی لاو بەرگەی ناگرێت، یان ڕەنگە ناچاربوبیت هەڵیبژێریت. ئەم ژیانە بێتام و بێڕەنگە هەموو خەیاڵەكانتی ڕووخاند و چاوەڕوانیەكانتی دارماند. وازت لەو خوێندنە هێنا كە زۆر حەزت لێ دەكرد و، گیرۆدەی كەسێكی وەك من بوویت كە سەرتاپای لە تاوان و خراپەدا نوقم بووە و، بوویت بە هاوبەشی ئەشكەنجە و ئازاری. وەكو خۆشت دەیبینیت ئیتر من هەموو شتێكم تەواوبووە و هیچ هیوایەكم نەماوە. كەسێكم هەتا ماوم لەسەر جێگەم. تۆش بەزۆور سەرمەوە بە بەردەوامی ئەزیەت دەبینیت و خزمەتم دەكەیت، بێ ئەوەی گوێ بدەیت بەوەی قاچێكت دەستكردە و گورچیلەكانت سستن. ئەم دەردە نهێنیەكەمە و، زۆر سەغڵەتم دەكات و، بڕستی لێ بڕیوم .

نیگـا بێچـارەکانی مەدینــەی بچـووك چـووە ســەر فرمێســکەکانم کــە هەرچەندم دەکرد بۆم نەدەگیران. بە دەستەسڕەکەی دەستی دەموچـاوی سڕیم.

بەردەوام بووم:

– ژیانی من تەواو. لە ملیۆنێکدا یـەك گریمـانی چاکبوونەوەم نییـە. لـە گۆشەی نەخۆشخانەیەکدا یـان لـە خانـەی بەساڵاچـووانـدا ئـەم جەسـتەیەم هەڵدەگرم. چەند ڕۆژم مابێت لە ژیاندا بەرگەی ئازار و ژانی دەگرم .

پێش ئەوەی قسەکەم تەواوبکەم چاوەکانی مەدینە کرانەوە و خـەریك بوو لـە جێـی خۆیـان دەردەهـاتن. قسـەکەی پـێ بـڕیم و بـە سەرسـامی و شپرزەیی هەستایە سەرپێ:

– ڕەسووڵ، تۆ دەتەوێت بڵێیت چی؟

– دەمەوێت بڵێم کە تۆ شایانی ئەم ژیانە نیت. تۆ پێویستت بە ژیـانێکی زۆر جوانە. شوێنی تۆ ئەم سزاخانەیە نییە، بەڵکو دەبێت لـە بەهەشـتێکی ئاسوودەدا بیت. لەمڕۆ بەدواوە ناتوانم ئەوە قبووڵ بکەم خزمـەتی تـەرمی زیندووی من بکەیت. من مردووم، ئیتر تۆش ئەمە قبووڵ بکە. دەمەوێت تۆ ڕزگارت ببێت. بڕۆرەوە بۆ لای خێزانت. ناهێڵم لەوە زیاتر تەمەنی گەنجیت بەفیڕۆ بدەیت. ئەگەر تۆزقاڵێك منت خۆش دەوێت بەگوێم بکە. من ئەگـەر تۆ لە ژیانێکی ئاسوودە و جواندا ببینم ئینجا بەختەوەر دەبم.

هێشتا قسەکانم بە کۆتا نەگەیشتبوون، کە مەدینەی بچووك تەقییەوە و، دەتووت دەستێکی نادیار توند قوڕگی دەگوشێت. وتی:

– لەوە زیاتر بەرگەی وڕێنە و قسە پڕوپوچەکانت ناگرم، ڕەسوڵ. تۆ دڵنیایت کە خەو نابینیت یان شێت نەبوویت؟ یان لەوانەیە ئەم کارەساتە ئەزێتی سەرتی دابێت و وردە وردە کاریگەری دەربکەوێت؟ من وا بیری لێدەکەمەوە کە شۆخی بکەیت و تەواو.

– نەخێر. شۆخی و گاڵتە ناکەم. چی لە دڵمدا بوو ڕاستگۆیانە وتم.

ڕوخساری شیرینی ڕەش داهات و چاوەکانی خەمیان لێ نیشت. وتی:

– کەوایە تۆش باش گوێم لێ بگرە ڕەسووڵ. منیش قسەی خۆمم هەیە بۆ وتن. لای ئێمە خێزان و شەرەف و کەسێتی و پەیمان، لە پێش هەموو شتێکەوەیە. ئێمە یەکجار کەسێکمان خۆش دەوێت و، یەکجار عاشق دەبین و، یەکجاریش گفت دەدەین. ئیتر کار لەوێدا تەواو دەبێت. تا مردن بەشداربوون لە ژیانێکی هاوبەشدا بۆ ئێمە شەرەفە .

حەزدەکەم باش ئەوە بزانیت کە هەزار ئەوەندەی ئێستا نەخۆش بوویتایە، دیسان ئامادەبووم لە ناخی دڵمەوە خزمەتت بکەم و لەگەڵتدا بم. چونکە خۆشەویستی ئێمە بۆ گۆشت و ئێسقان نییە. من نە عاشقێکم پاشگەز دەبمەوە و نە خیانەت لە خۆشەویستی دەکەم. داواکارم لەو خوا دانا و میهرەبانەی ئەم نەخۆشییەی بە تۆ داوە، گوناه و تاوانەکانم بە خزمەتکردنی تۆ بشۆرێتەوە. گوناهەکانی تۆش ئەم نەخۆشییە لەگەڵ خۆی دەیبات. واتە ئەم نەخۆشییەی تۆ گەورەترین تاقیکردنەوەی ئێمەیە. ئیشەڵڵا ئەم تاقیکردنەوەیەش دەبێتە هۆی لابردنی خراپەکانمان و ڕێگای ڕزگاریمان. لە ڕەحمەتی ئەو زاتە چاوەڕوانین ئەو ئاسوودەیی و

خۆشـییەی کـە لـەم دنیـا دۆزەخئاسـایەدا بـۆی دەگـەڕێین، لـە جیهـانی هەمیشەییدا پێمان ببەخشێت .

نەمزانی چی بڵێم. مەدینە میهرەبـانی خـوایی بـوو بـۆ مـن. گـرنگترین خاسـیەتی کچـی خۆرهـەڵاتیش هـەر ئەمـەبوو: مـەرد، فیـداکار، ڕاسـتگۆ، دلێر...

بڵێی لەم دنیایەدا دانەیەکی تری وەك ئەو هەبێت؟ خێزانەکـەی چـەند جـوان پێیـان گەیانـدبوو! خۆزگـە یـەك لـە ملیـۆنی ئـەو جـوانی و پـاکی و سەرڕاستییەی لەودا هەیـە لـە منـدا بووایـە و تووشـی ئـەو تاوانـە پیسـانە نەهاتمایە. لەپێناو کچی خۆرهەڵاتدا نەك گیانێك، هـەزاران گیـانم هەبووایـە ئامادەبووم هەمووی بەخت بکەم .

باوەشمان کرد بە یەکدا و تێر گریاین. بیرمـان لـە ڕۆژانـی ناخۆشـتر و تاقیکردنەوەی سەختتر کردەوە و، سوپاسی خوای خۆمان کرد.

### وانەیەکی دەرمان ئاسا

پاش هێوربوونەوەی هەستەکانمان، مەدینە ( پەیامی حەشر ) ی گرت بە دەستیەوە کە بـاس لـە ژیـان و زیندووبوونـەوەی دوای مـەرگ دەکـات. دەستی کرد بە خوێندنەوە. منیش هەرچەند بە خەیاڵیش بێت، باڵم گرت و بەرەو ئەو جیهانە فڕیم و، بۆ ساتێك ئازارەکانم لەبیرچووەوە.

"لە گەشتێکدا دوو کەس پێکەوە بۆ وڵاتێکی گەلێ قەشەنگ و تـابڵێی جوان و ڕەنگینی وەك بەهەشت ڕۆیشتن (مەبەسـت لـەم تەشـبیهە دنیایـە) کـە گەیشـتنە ئـەوێ، سـەرنجیان دا خـەڵکی ئـەو وڵاتـە دەرگـای دوکـان و

خانووەکانیان بە کراوەیی جێهێشتووە و، بایەخ بـە چـاودێری و پاراسـتنی خانوبەرە و دوکانەکانیان نادەن و، پارە و پوول و سـامانەکانیان بـێ هـیچ پاسەوانێك و بە ئاشکراو لەبەر چاو و دەستی خەڵکیدا داناوە!

کە ئەمەیان دی، یەکێکیان ـ بە هانـدانی دەروونـی بـەدخوازی خـۆی ـ ئەمـەی بـە هـەل زانـی و، پـەلاماری ئـەو کەرەسـە و شمـەك و پـارە و سامانانەی ئەوێی دا و، تاوێ تالآنی دەکردن و تاوێکی تر چیی بەردەست بکەوتایـە بـەدزی دەیـبردن.. بـەم جـۆرە، هـەر چەشـنە سـتەم و خراپەکارییەکی پێ کرا و لێی وەشایەوە درێغیی لێ نەکرد و، دانیشـتووانی وڵاتیش بایەخێکی ئەوتۆیان پێ نەدا!

هاورێکەی پێی وت:

ـ ( ئەوە چی دەکەیت؟.. بێ گومان تۆ هەر ئاوا ئەم کارانەت بەسەردا تێناپـەڕێت و لـە ئەنجامـدا سـزای ئـەم ڕەفتارانـەت دەچـێژیت و، منـیش ـ لەگـەڵ خۆتـدا ـ دووچـاری چـەندین بـەڵا و گیروگرفـت دەکـەیت. ئـەم سـامانانەی دەیانبینیـت، هـی دەوڵـەتن و، دانیشـتووانی وڵاتـیش بـە خاوخێزانەوە تێکڕا بوون بە سەرباز و کارمەندی دەوڵـەت و، بـە پۆشـاکی میللی (مەدەنی)یەوە لـە کـار و فەرمانبەرییەکانیانـدا خراونەتـە کـار، هـەر لەبەر ئەوەشە کە بایەخێکی ئەوتۆیان پێ نەدایت. ئنجا ئـەوەش بزانـە کـە یاسا و ڕێسای ئێرە گـەلێ تونـد و تیـژە و، لـە هـەموو لایەکدا تەلـەفۆن و چـاودێر و هەواڵدەر و پیـاوانی پادشـا بڵاوبوونەتـەوە. دەسـا هـەر ئێسـتا خێراکە و بەپەلە بڕۆ داوای لێبووردن بکە .)

بەڵام هاوڕێ گێژ و گەلحۆکەی، ئینکاری و سەرسەختی نواند و، وتی:

ـ ( ئەم سامانانەی دەیانبینیت هەرگیز هی دەوڵەت نین، بەڵکو بێخاوەن و گشتی و هەڕەمەکین و، هەموو کەسێك دەتوانێت بە ئارەزووی خۆی دەستیان بۆ ببات. ئەوەتا من هیچ شتێك نابینم ڕێی سوود وەرگرتنم لەم شتە جوان و ڕەنگینانەی بەردەمم لێ بگرێت. ئەوەش بزانە کە جگە لە شتێك بەچاو بیبینم باوەڕم بە هیچی تر نییە )! پاشان کەوتە قسەی پڕوپوچی وڕێنەئاسا و فەلسەفەلێدانی ئەم بۆچوونەی خۆی!

ئا لێرەدا گفتوگۆکەی نێوانیان پتر پەرەی سەند و کەوتە دۆخێکی توند و گەرمەوە و، بابای گێلی گەلحۆ لە هاوەڵەکەی زیاتر هاتە پێش و، لێی پرسی:

ـ ( ئایا پێم نالێیت پادشا کێیە؟.. من نایناسم!)

هاوڕێکەی وەڵامی دایەوە:

ـ ( تۆ گومانت لەو ڕاستیەدا نییە کە: گوندی بێ کوێخا و.. دەرزی بێ وەستا و خاوەن و.. پیتی بێ نووسەر نییە و نابێت. ئەی ئایا چۆن ئەوە بە خۆت ڕەوا دەبینیت کە پێت وابێت ئەم وڵاتە ڕێکوپێك و ڕەنگینە بێ پادشا و فەرمانڕەوابێت؟ یان چۆن ئەم هەموو سەروەت و سامانە بەنرخ و بەهادارانە بێ خاوەن دەبن؟ کە ئەوەندە زۆر و زەبەندە و بەردەوامن دەڵێی لە جیهانی پەنهانی غەیبەوە شەمەندەفەرێکی پڕ لە ئازووقە و ڕۆزی بەنرخ دەم بە دەم دێت و بارەکەی لێرەدا ڕۆدەکات و پاشان دەگەڕێتەوە و دەڕوات؟ ئایا نابینیت لە هەموو لایەکی ئەم وڵاتەدا

ئاگاداری و بەیاننامەکانی پادشا بڵاوکراونەتەوە و، ئاڵاکانی لە هەموو گۆشەیەکدا دەشەکێنەوە و، تەمغە و مۆری تایبەتیی خۆی لەسەر ئەو هەموو کاڵا و سەروەت و سامانانە نەخشێنراوە؟ ئیتر چۆن بە بێ خاوەنیان دادەنێیت؟.. )[1]

ئەو خوێندنەوەیە ئاسوودەیی و ئارامی بە دڵم بەخشی. هەنووکە نوێژی دوانیوەڕۆم بە جۆش و خرۆشێکی تر و هیوایەکی نوێوە دەکرد .

ڕۆژەکانمان بە ڕاهاتن لەگەڵ ئەم ژیانە نوێیەدا بەسەردەچوو. ئیتر مرۆڤ وایە، خۆی دەگونجێنێت لەگەڵ قورسترین و گرانترین باردا. یان ڕاستتر بڵێین خوای گەورە ئەوەندە ئازار بە بەندەیەکی دەبەخشێت کە بتوانێت هەڵیبگرێت. ئەوەی ئێمەش وەهابوو. هەستان و ڕۆیشتنم لەبیرچووەوە، لەسەر عەرەبانەکەم کتێبی زۆرم دەخوێندەوە و سوپاسی خوام دەکرد .

---

١- دەقی کوردی ئەم پارچەیە لە وەرگێڕانەکەی مامۆستا فاڕووق ڕەسوڵ یەحیاوە وەرگیراوە. بڕوانە: وتەکان، لا ٥٩ ـ ٦١

# بەشی نۆیەم



## ئیدی خەریك بوو نەتوانێ بەرگە بگرێت

نەخۆشیەکەی مەدینە بەخێرایی پەرەی دەسەند. هەرچەندە هەوڵێکی زۆری دەدا کە ئازارەکانی بخاتەوە ناو خۆی و بۆ منی دەرنەخات، بەڵام دەمزانی کە نەخۆشیەکەی گەیشتووەتە پلەیەکی ترسناك و هەڕەشە لە ژیانی دەکات. چیتر گورچیلەکانی کاریان نەدەکرد .

نەمدەویست بیر لە کۆتایی ئەو نەخۆشییە ترسناکە بکەمەوە... هەزاران جار ئامادەبووم تامی مەرگ بکەم، بەس شتێك بەسەر مەدینەکەمدا نەیەت. لەپێناوی ئەودا ئەگەر سەدان گیانم هەبووایە ئامادەبووم بیبەخشم. تەنانەت بیرکردنەوە لە ژیانێکی بێ ئەو، ئەشکەنجە بوو. ئەو هەموو شتێکی من بوو. لەگەڵ ئەودابوون خۆراك و ئاوبوو بۆ من. ئەگینا دەمێکبوو لەم جیهانە کۆچم کردبوو. ئەگەر هێشتا دەژیم و هەناسە دەکێشم، ئەوە بەهۆی نیازی پاك و بێگەردی مەدینە و ئەو پەیوەندییە بەتینەی بوو کە لەگەڵ خوای خۆیدا هەیبوو .

شەوێکیان تا بەیانی لەتاو ئازار ناڵاندی. بۆ چرکەیەک خەو نەچووە چاوی. لێم پرسی:

ـ نەخۆشیت؟ گورچیلەکانت ئێش دەکەن؟

ـ نەخێر، تەنها خەیاڵی ڕۆژانی ڕابردوو خەوی لێ زڕاندم و نەیهێشت بنووم .

لە دڵی خۆمدا دەموت: " ئاە، تۆ بۆ ئەوەندە باشیت؟ بۆچی ئەوەندە دڵپاک و تێگەیشتوویت؟ نازانم بۆ بوویت بە نسیبی کەسێکی بێنرخی وەک من، لەکاتێکدا کە شایانی باشترین ژیان و هاوسەر و خێزانیت؟"

ئەمە نهێنییەکی نادیاربوو. تێگەیشتن لەم ڕووداوە بە چاوی ژیری کارێکی ئەستەم بوو. بێگومان خوای گەورە کاروبارەکانی پڕبوون لە دانایی. هەست و ژیری و لۆجیك دەستەوسان بوون لە شیکارکردنی ئەم مەتەڵەدا .

بەیانی کە بۆ قاوەڵتی چووینە خوارەوە مەدینەی بچووك پەرێشان و ماندوو و بێتاقەت بوو. ئاوساویی دەموچاوی و ڕەنگی زەردی، هەموو شتێکی ئاشکرا دەکرد .

کاك ڕەسوڵ هەر بە ڕوانینێك تێگەیشت. خۆی پسۆڕی نەخۆشییەکانی کۆئەندامی میز و میزەڕۆبوو. تێگەیشتبوو کە چارەسەر بە دەرمان سوودێکی نییە. وتی:

- ئەمڕۆ پێکەوە دەچین بۆ نەخۆشخانە و پشکنینێکی گشتیت بۆ دەکەین. ئەو نیشانانەی کە هەتە وامان لێ دەکات بارودۆخەکە بەجددی وەربگرین .

ئەسمەرە جوانەکەم سەرەڕای نەخۆشییە تاقەتپڕووکێنەکەی کەچی دەترسا ئێمە ئەزێت بدات، وتی:

- من زۆر باشم. لەوانەیە نەخۆش دەربکەوم. بەڵام هیچ ئازارم نییە .

نەیدەویست ببێت بە ئەرك بەسەر شانی کەسەوە، ئەگەرچی گیان و ژیان و لاوێتی خۆی کردبوو بە قوربانی. دەیزانی کە ئێمە ئیتر لەوەدا نەماوین چارەسەر فریامان بکەوێت. تەنها بارێك و زیادەیەك بووین. یارمەتی و بەدەمەوە هاتنی کاك ڕەسوڵ و مەدینەخان لە هەموو کاروبارێکماندا و تەرخانکردنی ژیانی خۆیان بۆ خزمەتکردنی ئێمە، تووشی شەرمەزارییەکی زۆری دەکردین و نەماندەتوانی بچووکترین کێشەی دڵمان لای ئەوان بکەینەوە. واتە مەدینەکەم بەخێرایی هەنگاوی دەنا بەرەو مەرگ، بەڵام بۆ ئەوەی ئەزێتی کەس نەدات بچووکترین سکاڵای لە حاڵی خۆی نەدەکرد. هەر لەبەر ئەمەبوو کە مەدینەکەم وتی " باشم " و ئازارەکانی لە ناخیدا دەخواردەوە و، ژیانی دەخستە مەترسییەوە و، نەیدەویست ببێت بە ئەرك بەسەر کەسەوە.

کاك ڕەسوڵ و مەدینەخان بەزۆر مەدینەکەمیان ڕازی کرد. ئەو بەیانییە لەگەڵ کاك ڕەسوڵدا چوونە دەرەوە. منیش تا ئێوارە ئارام و

قەرارم نەبوو. پاڕامەوە و لاڵامەوە لە خوای گەورە کە چارەسەری هەبێت و مەدینەکەمم لێ نەسێنێت .

دەمزانی کە من لەم دنیایەدا زیادەم. دەشمزانی تا من لە ژیاندابم مەدینە زیاتر ئازار دەکێشێت. چونکە من دەمێکبوو لەوە دەرچووبووم کە هاوڕێیەك یان هاوسەرێك یان مێردێکبم. واتە تا من لە ژیاندا بوومایە مەدینە هەناسەیەکی ئاسوودەی هەڵنەدەمژی و ناخۆشییەکان کۆتاییان نەدەهات. بەڵام ئەوەم چۆنی بکردایە؟ چیتر نەمدەتوانی خۆم بکوژم. چونکە خۆکوژی گەورەترین تاوان بوو. تەنها ڕێگایەك هەبوو: لە خوای گەورە بپاڕێمەوە کە چی زووە ئەو گیانەی داویەتی لێم بسەنێتەوە...

ئەو ڕۆژە تا ئێوارە ئەم نزایەم کرد. بەڵام بۆ یەکێك کە تاقیکردنەوەی ژیانی تەواو نەبووبێت ئەوە سوودێکی نییە. پێویست بوو ئەو ئازارە بکێشم کە لە چارەم نووسرابوو. ئەو فرمێسکانەی کە دەبوو بیانڕێژم دەبوو بڕژێن. دەژیام لەگەڵ ڕەنج و مەینەتیەکاندا و لەسەر عەرەبانەکەم چاوەڕێی هاتنی فریشتەی مەرگم دەکرد. لەوانەیە ئەمە گرانترین چاوەڕوانی بێت...

## ئەنجامێکی پڕ نەهامەتی

کاتێك ئێوارە هاتنەوە بۆ ماڵەوە ویستم لە ڕوخساریاندا ئەوە بخوێنمەوە کە چی ڕوویداوە. لە نیگای کاك ڕەسوڵ و مەدینەخاندا نیشانەکانی ئازارێکی شارراوە بەدی دەکرا. مەدینەکەمیش بۆ ئەوەی من

خەفەت نەخۆم نەیدەهێشت زەردەخەنەی هەمیشەیی لە ڕووی جوانی ون بێت .

دەمزانی. ئەگەر حاڵی زۆر خراپیش بێت ئەو هیچ دەرناخات. چونکە نەمدەتوانی چاوەڕوانی بکەم، خۆم پێنەگیرا و پرسیارم کرد:

- چی بوو؟

دەتووت هەرکەسە و دەیەوێت وەڵامەکە بخاتە ئەستۆی ئەوەی تر. کەس نەیدەویست خۆی بکات بە خاوەنی. کاک ڕەسوڵ دەیزانی کە بەحەسرەتەوە چاوەڕێی وەڵامم. وتی:

- نیگەران مەبە. زانستی پزیشکی پێشکەوتووە لەم ڕۆژانەدا. خوا هیچ دەردێکی بێ دەرمان دروست نەکردووە .

وەڵامێکی دڵنیایی بەخش نەبوو. بۆنی نائومێدی لێ دەهات، وەك ئەوەی بڵێت: " چی بکەین هیچمان لە دەست نایەت ." وتم:

- زۆر خراپە؟

دیسان بۆ ساتێك بێدەنگی باڵی کێشا. پاش کەمێك کاك ڕەسووڵ ئەو کۆتاییە غەمگینەی درکاند کە دەبوو بوترایە.

ـ پشکنینێکی زۆریان بۆ مەدینەخان کرد. ئەنجامەکانمان لەگەڵ هەندێك لە هاوڕێ دکتۆرەکانمدا هەڵسەنگاند. تەنانەت ناردم بۆ دەرەوەی وڵات بۆ ڕاپرسیکردن بە دکتۆری ئەوێش .

ڕستەکان درێژدەبوونەوە و منیش لەگەڵیدا ترس و نیگەرانیم پتر دەبوو. ئازاری ناخم خەریکبوو هەناسەمی دەبڕی. خۆم پێنەگیرا:

- ئەنجامەکان چۆنن کاك ڕەسوڵ؟

کاك ڕەسوڵ نیگا بێڕەنگەکانی لە بۆشایی بڕی وەك ئەوەی داوای یارمەتی بکات. بە تۆنێکی بێچارانەوە بێ ئەوەی بابەتەکە لەوە زیاتر درێژبکاتەوە، ترسناکی دۆخەکەی لە ڕستەیەکدا کورت کردەوە:

- بەداخەوە گورچیلەکانی لەکارکەوتوون. هەموو ساتێك لەوانەیە ژیانی بکەوێتە مەترسییەوە .

ڕووخام. سەرم گێژی خوارد و دیوارەکان بەرەو ڕووم هاتن. هەموو شتێك ڕەنگ و تامی خۆی لەدەست دا. لە دنیای خۆمدا توامەوە و نەمام.

وەختێك کاك ڕەسوڵ بینی زۆر بێتاقەت بووم، وتی:

- بوەستە بزانم، ئەمە مانای کۆتایی هەموو شتێك نییە. دەرگای شیفای خوای گەورە تا کۆتا هەناسە کراوەیە. هێشتا چەند شتێك ماوە بیکەین.

وەك کەسێك لە سەرەمەرگدا سەرلەنوێ ژیانی بەبەردا کرابێتەوە، بەپەلە پرسیم:

- چی؟

- چاندنی گورچیلە...

- لێرە دەکرێت؟

- زۆر ئاسان نییە. بەڵام هەموو ڕێیەك دەگرینە بەر. گەر پێویست بکات ئێمە گورچیلەیەکی دەدەینێ و بە دانەیەك دەژین .

فیداکاری تا ئەو ڕادەیە؟!

ئەو فیداکارییە زۆر کاری لێکردم. سەرم لەو میهرەبانییە بێسنوورە سووڕما.

بەخشینی گورچیەکانمان، ها؟

خێرا قیڕاندم:

- ئەوەی منی بدەنێ!

لەوە زیاتر خۆم پێنەگیرا و سەرم داخست. هەنسک قوڕگی گرتم.

ئەگەر مەدینەکەم گورچیلەی لەکارکەوتبێت، ئەوانەی من بۆ چ ڕۆژێك باشن؟ بیدەنێ، هەردووکی بدەنێ، با ئەو ڕزگاری ببێت.

مەدینەکەم بە گوێمیدا چرپاند:

- خەم مەخۆ، خوا کەریمە. ئیشەڵا موحتاجی گورچیلەی کەس نابین!

لە هۆڵەکەدا لە دەوری یەك خڕبووینەوە بۆ تاوتوێکردنی بابەتێکی گرنگ. نەخۆشی بێئامانی مەدینە دڵی هەموانی تاوداوبوو. ڕوخسارمان غەمگین و دڵمان تەنگ بوو.

کاك ڕەسوڵ وتی:

- بەیانی مەدینەخان لە نەخۆشخانە دەخەوێنین. ئیتر ئەو پێویستی بەوەیە ڕابکێشێت و خۆی ماندوو نەکات. لەمەولا هەموو ساتێك لەژێر چاودێری پزیشکدا دەبێت. سەرەتا بەدوای گورچیلەیەکی گونجاودا دەگەڕێین بۆ کچەکەمان. هەموو سەنتەرەکانی ناوەوە و دەرەوەی وڵات

بەسەردەکەینەوە. ئەگەر دەستمان نەکەوت ئەوکات سەرەی گورچیلەکانی ئێمە دێت.

نەخۆشییەکەی زۆر گران بوو. ئیتر مەدینە لە نەخۆشخانە لەسەر پێخەف چاوەڕێی هەواڵی گورچیلەیەکی گونجاوی دەکرد و منیش لە ماڵەوە لەسەر عەرەبانەیەك چاوەڕێی هەواڵی مەدینەم دەکرد. واتە ڕۆژانی زۆر سەخت یەخەیان گرتبووین.

نازانم دەبێت چ ناوێك لە کاك ڕەسوڵ و مەدینەخان بنرێت؟ دوو گەنج لەسەر شەقام خۆیان دەنێنە ژێر ئوتومبێلەکەیان، ئەوان خۆیان دەکەن بە خاوەنیان و وەکو ڕۆڵەی خۆیان تەماشایان دەکەن. سەرەڕای ئەوەش ئامادەن گورچیلەکانی خۆیانیان پێ ببەخشن!

دیسان خەیاڵ بردمیەوە. لە دڵی خۆمدا وتم: " خۆزگە هەموو کەسێك وەك ئێوە باش دەبوو. کەواتە ئەوەی کە هێشتا شاخەکان بەپێوەن و، درەختەکان بالا دەکەن و، زەوی ڕۆناچێت و، دەریاکان وشك نابن، بێگومان بەهۆی کەسانی دروست و فیداکاری وەك ئێوەوەیە. ئەگینا بۆچی خوای گەورە دنیا ئاوەدان بکاتەوە بۆ کەسانی خراپ و ترسناك و دووڕوو و، نیعمەتیان بەسەردا ببارێنێت؟

کەواتە ئەگەر ڕەوشتی قورئانی لە سینەی بەندەکاندا نەمێنێت، چیتر خوای گەورە لەخۆڕایی ئەم دنیایە ناژیەنێت. دەیکێشێت بە کۆمەڵی ئەستێرەیەکی تردا و قیامەت بەرپا دەکات. لەبەر خاتری کەسانی پاك و

باش بوو کە هێشتا ژیان ماوە و، ئێمەش لە سایەی خزمـەتی فیداکارانـە و دڵسۆزانەی کاك ڕەسوڵ و مەدینەخاندا دەژیاین .

لەبەر خاتری مەدینەکـەم هـەوڵ و تەقەلایـەکی زۆر درا. کـاك ڕەسـوڵ هـەموو سـەنتەرە تەندروسـتیەکانی ئاگـادارکردبووەوە و هـەموو لایەنـە پەیوەندیدارەکانی خستبووە ئامادەباشییەوە. ئەم کاروبارە ڕۆژانی خایاند و چەند مانگێك تێپەڕی. هەموو شەوێك بە هیوایـەکی نوێـوە دەنووسـتین، هەموو بەیانیەك بە ئومێـدێکی تـازەوە هەڵدەسـتاین. وەلێ ئـەو ئەنجامـەی پێـی گەیشـتین هـەمووماني پسـاند. بەداخـەوە گورچـیلەیەکی گونجـاو نەدۆزرابووەوە.

تا دەهـات حـاڵی مەدینەکـەم خـراپتر دەبـوو. بـەهۆی مەکینەیەکـەوە بەردەوامی بە ژیان دەدا.

## یارمەتی وەهام نەدیبوو

وەکو دوایین تروسکایی پشکنین بۆ هەریـەك لـە گورچـیلەکانی مـن و کاك ڕەسوڵ و مەدینەخان کرا. هەموو تاقیکارییەکان گونجاویی گورچیلەی مەدینەخانیان نیشان دەدا. لەکۆتاییدا بڕیار لەسەر ئەو درا. بەڵام نە من و نـە مەدینـە بچووکەکەم بـەوە ڕازی نـەبووین. نەماندەویسـت لەبـەر ئێمـە مەدینـەخان بـە نیـو مرۆڤـی بمێنێتـەوە. خەفـەتم دەخـوارد و دەمـوت: " خۆزگە ئەوانەی منی بۆ دەبوو و هـەردووکیانم دەدایە. بـەس مـن شانسـی وام لەکوێ بوو!.. لە ژیانمدا بە کەڵکی چ کارێکی باش هاتبووم و تا ئەمـە دووهەم بێت؟"

مەدینەخان بۆ ئەوەی کەمێك ئەو خەم و خەفەتـەم لێ کـەم بکاتـەوە، هات بۆ لام. وەکو دایکێکی میهرەبان و بەسۆز، وتی:

ـ هیچ خەمت نەبێت. من بە خۆشحاڵییەوە گورچیلەم دەدەم. ئێوەش دەزانن کە کوڕەکەم بەهۆی سستی گورچیلەوە کۆچی دوایی کـردووە. مـن دەزانم ئەو ئازارە مانای چییە. شوێنێك نەما سەرمانی پێدا نەکەین، بـەڵام هیچمان دەست نەکەوت. کاتێك سەری لـە کۆشمـدابوو و گیـانی دەکێشـا، ئامادەبووم گورچیلەکانم و هەموو ژیانم لەپێناویدا بدەم. وەلێ نـەبوو. ئـەو ئاگرە ئێستاش ناخم دەسووتێنێت.

ئەمێستا خوای گەورە دەرگایەکی وای کردووەتەوە. ئەو گورچیلەیەی کە دەمویست بیـدەم بـە کوڕەکـەم و نـەگونجا، هەنووکـە دەیبەخشـم بـە یـەکێك کـە هێنـدەی کچـی خـۆمم خۆشـدەوێت و نـاوی منـی هـەڵگرتووە. تەنانەت ئەمە وەکو سوپاسگوزارییەك دەبینم. چەند خۆشـە کەسـێکی تـر هەڵگری گورچیلەی من بێت و ببێـت بـەهۆی ژیـانی! مەدینـە گیـان کـە تـا ئێستا وەك کچی مەعنەویم چاوم لێ دەکرد، لەمەولا دەبێت بە کچی ئەسڵی خـۆم و پارچـەیەك لـە گۆشـت و خـوێنی مـن هەڵدەگرێت. خـوای گـەورە منداڵێکی لێ سەندمەوە، وەلێ دووانی بۆ ناردم.

نازانم دەبێت چی بوترێت سـەبارەت بـەم دڵـەی کـە بەقـەد دەریاکـان بەرینە؟ بەم مرۆڤانەی کە وەك کانی خۆشەویستییان لێ هەڵدەقوڵا؟ نـازانم چۆن سوپاسی ئەو چاکەکاری و لەخۆبوردەییەی ئەوان بکەین؟ چیمان لـە دەست دێت جگە لە سوپاسگوزاری بۆ خوای میهرەبان؟ کاتێك هەموو ئەم

نیعمەتانـە دەبەخشـێت بـە ئێمەیـەك کـە فڕێدرابووینـە سـەر کوچـە و شەقامەکان!

"خوای گـەورە ! چۆن دەکرێـت سـەری سوژدە بۆ قـەدەری پـڕ لـە دانایی و حیکمەتی ناسك و نهێنیی وردت کـەچ نەکـەین؟ چـی تـر دەکرێت جگە لە کەوتنە سەر ئەژنۆ و پاڕانەوە لە تۆ؟ چ وشەیەکی تر شایانی وتنە جگە لە ناوهێنانی تۆ؟

ئەو فرمێسـکانەی کـە لـە چاومەوە ڕیزیـان دەبەسـت، دڵۆپی شـادی بوون. خۆشی دۆزینەوەی دەرمان بوو لەنێو خودی نەخۆشیدا .

قەدەری خوا لە دواساتدا بـە قەڵـەمی قـودرەت ڕووداوەکـەی گۆڕی و ژێرییەکانی سەرسام کرد و، دڵانـی سوپاسـگوزار و هۆکارەکـانی سـەروژێر کرد.

## ڕووداوە پڕ نهێنییەکە

ئەو ڕۆژەی کە بڕیاربوو نەشتەرگەرییەکی تێدا بکرێت، هەواڵێکی کـاك ڕەسوڵ تەواو سەرسامی کردم. ئایا نموونەیەکی تری وەك ئەمە هەیە؟ یان شتێکی تری لەم بابەتە بینـراوە؟ کـەس بیسـتوویەتی؟ دیـارە کـە ئیمـانی بەهێز و دامەزراوی مەدینەکەم و، خۆڕاگری و سوپاسگوزاری بێوێنەی، بوو بە هۆی کرانەوەی دەرگای فراوانی ڕەحمەت.

خوای گەورە وانەیەکی شەفەقەت و میهرەبانی بـەو بەندەیـەی وتـەوە کـە ئـەوی زۆر خـۆش دەوێـت. بـەجۆرێك هـەر کاتێـك ئـەم ڕووداوەم بیربکەوێتەوە تەزوو بە جەستەمدا دێت .

ئـەو بەیانییـە هـەموو ئامادەکارییـەکان کرابـوون. لـە یـەك کاتـدا مەدینەکەم و مەدینـەخان ئامـادەی نەشـتەرگەری گواسـتنەوەی گورچـیلە کرابوون.

مەدینـەی بچـووك ئامێرەکـان لـە جەسـتەی کراونەتـەوە و چـاوەڕێی نەشتەرگەری بووە. وتوویەتی کە پێویستی بە سەرئاوە. سسـتەرەکە لـەم داوایە زۆر سەری سووڕماوە و، وتوویەتی:

- گورچیلەکانی تۆ کار ناکەن. بە یارمـەتی ئامێرەکـان میـز دەکـەیت. چۆن دەکرێت تۆ پێویستت بە چوونە سەرئاو بێت؟

خێرا دکتۆرەکان لەژوور سەریدا کۆبوونەتـەوە. بەپەلـە گورچـیلەکانی پشـکنراون و تاقیکردنـەوەیان بـۆ ئـەنجام دراوە. دەرکـەوتووە کـە هەردووکیان ئاساین و هیچ نیشانەیەکی نەخۆشییان نییە!

لـە هەمبـەر ئـەم ڕووداوە نائاسـاییەوە هـەموو پزیشـکەکان سـەریان سووڕماوە و لە نەشتەرگەرییەکە پەشیمان بوونەتـەوە. ئـەم حاڵەتـەی کـە ژیری مرۆڤ دووچاری سەرسامی دەکات، منیشی شۆك کرد. بەجۆرێ چـەند کاتژمێرێك نەهاتمەوە سەر خۆم. دەترسام هەڵەیەك کرابێت یـان هەواڵەکـە ڕاست نەبێت. بەڵام کاتێك مەدینەکەمم بە ساغ و سەلامەتی لە بەرامبەرمدا دیتەوە بوو بە جەژنم.

ئەم خانمە ئەسمەرە جوانە فریشتەئاسایە، دەرکەوت کە زۆر بـەڕێزتر و مـەزنترە وەك لـەوەی مـن گومـانم بردبـوو. چـەندەها ڕۆژ سـوژدەی

سوپاسگوزاریمان دەبرد بۆ ئەو خوایەی کە بەو ڕووداوە پڕ نهێنییە دڵی خۆش کردین .

مەدینەکەم وەکو حۆری بەهەشت بە خشوعەوە دیوی ناوەوەی ئەو ڕووداوە پڕ لە ڕاز و ئەفسوونەی بۆ گێڕاینەوە:

ـ ناتوانم هیچ شتێك لە ئێوە بشارمەوە. حەزدەکەم ئەوە بزانن کە ئەو کەسەی شایانی ئەم ڕێزلێنانە خواییەیە من نیم، بەڵکو دایە مەدینەمە کە ویستی گورچیلەی بە من ببەخشێت. لەبەر خاتری ئیخلاسی خاوێن و دڵسۆزی بێخەوشی ئەوبوو کە خەوای گەورە ئاوڕی میهرەبانی لێ داینەوە .

شەوی پێش نەشتەرگەرییەکە تەنها شتێك کە لە خەیاڵمدابوو ئەوەبوو کە مەدینەخان پاش بەخشینی گورچیلەیەکی بە من، ژیانی بە تاقە دانەیەکەوە بەسەر دەبات. بۆیە تا بەیانی دوعام دەکرد و دەموت: " خوایەگیان، گیانم بکێشە و با مەدینەخان ئازار نەچێژێت" !

چاوم چووە خەو و خۆم لە ژووری نەشتەرگەریدا دییەوە. چواردەورم پڕبوو لە پزیشکانی سپی پۆش. بەڵام هەموویان سیمایان نوورانی و ڕیشیان هەبوو. مێزەری پاکی سپی لە سەریاندابوو. لە دڵی خۆمدا وتم: " ئای لەوە ! خۆ لەم وڵاتەدا کارمەندی دەوڵەت بۆی نییە ڕیش بهێڵێتەوە و مێزەر لەسەر بکات. یان ئەمان نەیانبیستووە، یان ئەو یاسایە هەڵگیراوە و من ئاگام لێی نییە" .

پاشان کەسێکی باڵامناوەندی ڕیش سپی کە مێزەری سەوز و جبەی سەوزی پۆشیبوو هاتە ژوورەوە. دیاربوو مامۆستای ئەوانی ترە، هەربۆیە

خێرا بەپێزەوە ڕێیان بۆ کردەوە. ڕاست بۆ لای من هات. لە ناخی دڵیەوە و بە دەنگێکی گەرم و شیرین، وتی:

– خوا شیفات بدات کچم. ئێمە پزیشکی مەعنەوی تۆین. کارمان ئەوەیە بە ئیزنی خوا یارمەتی دۆستانی خوا و، موسوڵمانانی لێقەوماو و، ستەملێکراوان بدەین. تۆ ستەمێکی گەورەت لێ کرا و لای خوای گەورە بە ستەملێکراو ئەژمارکرایت. لەبەر ئەوە خوای گەورە ڕێی نەدا خۆت بکوژیت. وابەستەیی و ملکەچیت بۆ خوای میهرەبان بوو بەهۆی کردنەوەی ئەم دەرگایە .

مەترسە هیچ ئازارت ناگات. تا تۆ فاتیحەیەك و سێ ئیخلاس دەخوێنیت ئێمە نەشتەرگەرییەکەت بۆ تەواو دەکەین .

دەی بسم الله...

لە سەرسامیدا نیشتمە سەر ئاو و سەرم سووڕما لە ڕێزلێنان و میهرەبانی خوایی. ناخم پڕبوو لە ئارامی و ئاسوودەیی نەك ئازار. دەتوت ئەو دەستانە بەر هەر شوێنێکم دەکەوتن ئازارەکەیان نەدەهێشت و ئاویان دەکرد بە بڵێسەی گورچیلەکانمدا کە چەندین مانگ بوو ژیانیان لێ تاڵ کردبووم. لەو چرکەساتەدا لە ناخی ویژدانمدا هەستم بە ڕەحمەت و شەفەقەتی خوایی کرد کاتێك سەرلەنوێ ژیانم پێدەداتەوە .

ئیتر نازانم ئەو ساتە چۆن هات و چۆن گوزەشت. دەتووت کاتژمێرەکان بێدەنگ بوون و، کات خامۆش بووە و، دنیا وەستاوە. تەنها شتێك کە لەو دەمەدا هەستم پێدەکرد، ئەو ئاسوودەییەبوو کە خوا لە دڵی

هاویشتبووم. بەجۆرێك بۆ یەکەم جار بەڕوونی گوێم لە لێدانـەکانی دڵ بـوو کە دەیانوت " الله، الله! "

پاشان ئەو زاتە سەوزپۆشە، وتی:

- دەی کەفارەتت بێت کچم.

پەرداخێك ئاوی پێدام و، وتی:

- دەی ئەم ئاوە شیفایەش بخۆرەوە.

بە پەنجە لەرزۆکەکانم بەحاڵ پەرداخەکەم بۆ گـیرا و پـاش (بسـم الله) خواردمەوە. دەتـوت ئـەوە ئـاو نییـە کـە دەیخۆمـەوە، بـەڵکو دەرمـانێکی کاریگەرە و بەر هەر جێیەکم بکەوێت ژیانی تێدا دەبووژێنێتەوە .

کاتێـك خۆیـان بـۆ ڕۆیشـتن پێچـایەوە، مـن بـە شـەرمەوە لـە مامۆستاکەیانم پرسی:

- ئێوە کێن؟ ئەگەر لێم بپرسن بڵێم چی؟

زاتە سەوزپۆشەکە ئاوڕی دایەوە و، وتی:

- گرنگ نییە من و هاوڕێکانم کێین کچم. گرنگ ئەوەیـە تـۆ شـایانی ئـەم ڕێزلێنانە بوویت. پیرۆزباییت لێدەکەم.

- توخوا خۆتـانم لێ مەشـارنەوە. دەمـەوێت ئـەو زاتانـە بناسـم کـە ئـەم یارمەتییـەم دەدەن. هـیچ نـەبێت دەمـەوێت بـە دوعـا کـەموکوڕەکانم ئـەم قەرزە مەعنەوییە بدەمەوە.

ئەو زاتە موبارەکە بەهەیبەتە سەری ڕاوەشاند و، وتی:

– له داهاتوودا تێدەگەیت ئێمە کێین، بەڵام ئێستا نا. ئەگەر خوای گەورە ئیزن بدات...

لەناکاو حەزرەتی عبدالقادری گەیلانی هات بە خەیاڵمدا. بیری ئەو دەستگیرۆییە مەعنەوییەم کەوتەوە کە بە مۆڵەتی خوای گەورە یارمەتی تەنگەتاوان دەدات. لەبەرئەوەی لە پەیامەکانی نووردا ئەم جۆرە کاروبارە سەرسووڕهێنەرانەی حەزرەتی گەیلانیم خوێندبووەوە، ئەوەندەی تر گومانەکەم بەهێزبوو. بۆیە خێرا ڕاست بوومەوە و ویستم دەستی ماچ بکەم. وەك ئەوەی دەروونم بخوێنێتەوە دەستی بەرز کردەوە و، وتی:

– نەخێر. من وای دادەنێم کە دەستی منت ماچ کردووە. بەڵام شوێنی من مەکەوە. تۆ ئەو سەرچاوەیەت دۆزیوەتەوە کە سوودی لێ وەردەگریت. بیانخوێنەرەوە و هەوڵ بدە خەڵکیش بیانخوێنێتەوە. ڕێنیشاندەر و ئیمامی ئەم چەرخە ئەوانن.

## نەیاندەتوانی بڕوا بەمە بکەن

لەپڕێکدا بەئاگا هاتمەوە. لە نەخۆشخانە لەسەر پێخەفەکەم بووم و هەموو گیانم ئاوبوو. دڵم بەتوندی لێی دەدا و دەتووت دەیەوێت لە قەفەزی سنگم دەرپەڕێت. هێشتا لە هەوڵی لێکدانەوەی خەونەکەمدابووم، کەچی ئەو ئاوەی خواردبوومەوە فشاری بۆ هێنام و هەستم کرد پێویستم بە سەرئاوە.

لـــه دڵـــی خۆمـــدا وتم: " ئـــای خوایـــه گیـــان! مـــن گورچـــیلەکانم لەکارکـەوتوون و چـەندەها ڕۆژە نـاتوانم میـز بکـەم. لەڕێگـەی شـۆردنی گورچیلەوە دەتوانم ئاوی زیادەی لەشم فڕێ بدەم" .

خێرا دەسـتم نـا بـە زەنگەکـەدا. بـەپڕتاو پەرسـتارەکە هـات بـۆ لام. کاتێـك وتم پێویسـتم بـە سـەرئاوە، سـەری سـوڕما. منـیش خـۆم سـەرم سووڕمابوو. هەرچەندە هیچ سەیر نەبوو بۆ خوایەك کـە ئاگـای لـە هـەموو نەخۆشییەکان و چارەسەرەکان هەیە.

خوای گەورە لەبەر خاتری من نا، بەڵکو لەبەر خاتری مەدینەخان ئەم چاکە گەورەیەی لەگەڵ نواندین. چونکە ئەو وەك فریشتە پـاك و بێگـەرد و فیـداکارە... لـە هـەزاران قوتابییـەوە دوعـای خێـری بـۆ دێـت. ژیـانی بـۆ وتنەوەی وانەی ئیمانی و قورئان تەرخان کردووە. خوا دەزانێت، لەوانەیـە سەدان و هەزاران خوێندکاری تریش موحتاجی یارمەتیدانی دایـە مەدینـەم بن. خوای گەورە لەبەر ئەم پەیامە پـیرۆزە نەیهێشـت مەدینـەخان نیـوەی بمێنێتەوە و ئازار بکێشێت.

ئەم باس و خواسە لە جیهانێکەوە بـۆ جیهـانێکی تـری بـردین. تاوێـك دڵمـان پـەروازی دەکـرد و تاوێـك کـانی چـاومان دەتـەقی. ئـەم وتانـەی مەدینەکەم ئاراميیان گەڕاندەوە بۆ ناخم. دەستم بەرزکردەوە و سوپاسـی زۆری خوای گەورەم کرد.

## مەدینەی کچکە دەست بەتاڵ دانەدەنیشت

ئەم ڕووداوە زۆر کاری لێ کردین. بەڵام کاریگەری ڕاستەقینە لەسەر مەدینەکەم بوو. چەندین مانگ لەو کەش و هەوا ئەفسووناوییە نەهاتە دەر. هەمیشە پەرستشی دەکرد و خۆی تەرخان کرد بۆ قورئان خوێندنەوە و موتاڵاکردنی پەیامەکانی نوور کە تەفسیری قورئانن. یارمەتی مەدینەخانی دەدا لە خزمەتی ئافرەتان و وانە ئیمانیەکاندا. ئیتر ئەو بووبوو بە پاڵەوانی ئیمان. لە هەموو فرسەتێکدا خۆشی خۆی دەردەبڕی و، دەیوت: "خوای گەورە مەزنترین چاکەی لەگەڵ کردین و بەم ڕاستییە جوانانەی ناساندین" .

هەفتانە سێ وانەی ئیمانی بە کچانی تازەپێگەیشتو دەوتەوە. دوو ڕۆژیش بەشداری ئەو وانەیەی دەکرد کە مەدینەخان بە کچانی زانکۆی دەوتەوە. لەم نێوەندەشدا منی لەبیرنەدەچوو و ڕۆژانە چەند سورەت و دوعایەکی پێ لەبەردەکردم. بەلای کەمەوە لە هەفتەیەکدا کتێبێکی تەواو دەکرد.

مەدینەکەم کەوتە پلان دانان بۆ داهاتووش. خۆی لە خۆیدا کچێکی زیرەك و بەتوانای وەك ئەو نەیدەتوانی لەماڵەوە دەستبەتاڵ دابنیشێت .

## تێڕوانینەکانی کاك ڕەسوڵ

ئەو ئێوارەیە لەسەر سفرەی نان خواردن، بە وتەکانیدا دەردەکەوت کە کاك ڕەسوڵ چ پیاوێکی بەشەوقە لە خزمەتدا.

ـ خوای گەورە ئەم خزمەتی ئیمان و قورئانەی پێ لوتف کردین. ئەمە گەورەترین ڕێزلێنانی خواییە. بۆیە پێویستە ئێمە بە کارکردن و خزمەت کردن سوپاسگوزاری دەربڕین. لە چواردەورماندا هەزاران لاو لە ڕێگای هەڵە و دەریای تاواندا خەریکن ژیانی خۆیان وێران دەکەن. ئێمە پێویستە یارمەتی ئەمانە بدەین و دەستیان بگرین. ئەگەر ئێمە ئەم ڕاستییە جوانانە نەگەیەنین بەو کەسانەی کە پێویستیانە، لە حزووری خوای گەورەدا یەخەمان دەگرن. ئەم کارە بەرپرسیارێتییەکی مەزنە. بەپێچەوانەوە وەك ئەوەیە پزیشکێك خاوەنی دەرمانێکی کاریگەربێت و تەمەڵی بکات لە بەدەمەوەچوونی نەخۆشەکانیدا. بێگومان ئەم پزیشکە لەسەر یەك بە یەکی ئەو نەخۆشانە لێپرسینەوەی لەگەڵ دەکرێت. ئێمەش حاڵمان وایە. لەم ڕۆژگارەدا پەیامەکانی نوورمان لە بەردەستدایە کە تەفسیرێکی مەعنەوی و هاوچەرخی قورئانی پیرۆزە. گەورەتین ئەرکی سەرشانمان ئەوەیە سەرەتا خۆمان باش لێیان تێبگەین و هەرسیان بکەین، پاشان بیانگەیەنین بەو کەسانەی کە پێویستیانە. ئەگەر خوانەخواستە گەنجانی ئەم سەردەمە بە بێ ئیمانی بمرن و لە قیامەتدا بڵێن: " ئێمە کەس ئەم حەقیقەتانەی تێنەگەیاندین و کەس بۆی باس نەکردین.". بۆ ئەوەی بەرپرسیار نەبین لە بێباوەڕی ئەوان، پێویستە شەو و ڕۆژمان بخەینە سەر یەك.

پێویستە لەم سەردەمەدا ئامانجمان ڕزگارکردنی گەنجانی موحتاج و، کەسانی بێباوەڕ و، ستەملێکراوان بێت. ڕەنگە ئا بەم شێوەیە بتوانین

شوکری ئەم حەقیقەتە ئیمانییانە بکەین کە خوای گەورە پێی بەخشیوین. ئەگینا بەسەربردنی ڕۆژەکانمان تەنها بە نوێژکردن لە بەرپرسیارێتی بەندایەتی قوتارمان ناکات. گەورەترین ئەرکی بەندە ئەوەیە هاوڕێ لەگەڵ نوێژەکانیدا ببێت بە هۆکار بۆ کاری چاك و کەسانی باش پەروەردە بکات. ئەمەش پێویستی بە هەوڵ و فیداکاری هەیە. ئەگەر دەمانەوێت کۆمەڵگا چاك بکەین، سەرەتا دەبێت لە خۆمانەوە دەست پێبکەین و پاشان هەوڵی ڕێنمایی کردنی دەوروبەرمان بدەین. لەبەر ئەمە پێویستە نموونەیی بژین و ببین بە سەرمەشق بۆ کەسانی تر. بە مانایەکی تر ڕاستییەکان تەنها بە وتن دەرنەبڕین، بەڵکو بە هەڵسوکەوتیشمان پیشانی بدەین. خۆی لە خۆیدا ئەمە کاریگەرترین شێوازی فێرکردنە.

پێویستە بە هیچ جۆرێك ئەوەمان لەبیرنەچێتەوە کە لە دادگای دواڕۆژدا لەسەر چۆنێتی بەسەربردنی ژیانمان لێپرسینەوەمان لەگەڵ دەکرێت. ئەی دواتر؟ یان بەختەوەری هەمیشەیی، یاخود بەدبەختی هەتاهەتایی... ناکرێت لە دنیادا بە کامی دڵی خۆمان بژین و لەوێش داوای بەهەشت بکەین. ئەمە مەحاڵە! بەهەشت پێویستی بە کۆشش و ناڕەحەتی و ئێش و فیداکاری و تەمەنێك چلەکێشی هەیە.

بۆیە پێویستە ڕێکوپێك و بەپرۆگرام بژین. دەبێت پلانی ڕۆژانەمان هەبێت و پەیڕەوی بین. تەنها بەم شێوەیە دەتوانین خۆمان نوێ بکەینەوە. ئەگینا تووشی تەمەڵی دەبین و دەپووکێینەوە.

## پێویستی پلان و بەرنامە لە ژیاندا

پێش ئەوەی کاک ڕەسوڵ بگات بە کۆتایی وتە بەنرخەکانی هەڵمدایە و، وتم:

- باشە، ئەو پلانە ڕۆژانەیە پێویستە چۆن بێت؟ چۆنی دەتوانین شتێك ئامادە بکەین کە بە باشی پەروەردەمان بکات؟

مەدینە سەیری کردم. بە چاوەکانی ویستی بڵێت: " ئەو گوتارە خۆشەت بۆ پێبڕی؟."

کاك ڕەسوڵ وەك ئەوەی هیچ نەبووبێت هەوڵی وەڵامدانەوەی پرسیارەکەی منی دا:

- پلان بە گوێرەی توانا و لێهاتنی کەسەکە و تەمەن و ئەو کارەی کە دەیکات دەگۆڕێت. وەلێ هەموو پرۆگرامێك سێ یاسای نەگۆڕی هەیە:

١- نووستنی بە پرۆگرام و دیاری کراوبێت.

٢- دووربوون لە هاوڕێی زیانبەخش و شوێنی خراپ.

٣- باوەڕبوون بە سەرکەوتن.

هەرکەسێك ئەمانە بکات بە بنەڕەت دەتوانێت پەیڕەوێکی نموونەیی بۆ خۆی دابڕێژێت. گرنگترین بەشی پلانی ڕۆژانە لەخۆپرسینەوەی ڕۆژانەیە. هەر مرۆڤێك بیەوێت پەیڕەوی لە پرۆگرامێك بکات پێویستە شەوان کاتێك سەر دەنێتە سەر سەرین، بە کردارەکانی ئەو ڕۆژەیدا بچێتەوە و، بەجددی چاو بخشێنێت بە ئەنجام و بەرهەمەکانیدا. دەبێت ویژدانی سەرگەرمی ئەم چەشنە پرسیارانەبێت: " ئەمڕۆ من چ کارێکم

کردووه لە قازانجی خۆم و کۆمەڵگەکەم؟ لە چ خوویەکی خراپ خۆم پاراستووە؟ چ هەڵسوکەوتێکی خراپی خۆمم چاك کردووە؟"

ئەگەر هەڵەیەك یان ڕەوشتێکی چەوتی لە دەست قەوما، پێویستە لە ناخی خۆیدا هەست بە ئازار بکات و لە حزووری خوای گەورەدا بەڵێن بدات کە جارێکی تر دووبارەی ناکاتەوە. لەبەر ئەمە پێویستە هەموو شەوێك ئەم پرسیارە لە خۆی بکات: " ئەگەر تەمەنم تا بەیانی بڕنەکات و هەڵنەسمەوە، ئایا تا چەندێك ئامادەم بۆ لێپرسینەوە؟ ". ئەگەر زایەڵەی ویژدان دەنگی " ئامادە نیت! " ی لێ بەرزببێتەوە، پێویستە لە خوای گەورە بپاڕێتەوە کە فرسەتی بدات تا ئەو کاتەی ئامادە دەبێت. چونکە هەزاران کەس شەو دەنوون و بەیانی هەڵناسن، یاخود بەیانی ڕۆژ دەکەنەوە و ناگەنە ئێوارە.

ئەگەر کەسێك لە لەخۆپرسینەوەی ڕۆژانەدا ڕووسووربێت، مانای وایە ئامادەیە بۆ لێپێچینەوەی مەزنیش .

پاش گوێ گرتن لەو وتە بەسوودانە، من و مەدینەکەم کەوتینە خەمی دانانی پرۆگرامێکی ڕۆژانە. بەتایبەتی کاتێك ئەو پرسیاری ئامادەبوونەم لە نەفسی خۆم کرد، هەزاران سەدا وەك ئەوەی کۆرسێك بن پێکەوە هاواریان کرد: " نەخێر! هێشتا زۆر زووە! ". کەوایە ئامادە نەبووم بۆ ئەو مردنەی کە هەموو چرکەیەك دەگونجا دەرگاکەی لە ڕوومدا بکرێتەوە. باشە، لەکاتێکدا ئەمەم دەزانی، بۆچی هەوڵی قەرەبووی خراپەکانم نەکەمەوە؟

## خەیاڵەکەی مەدینە

مەدینەش پرسیاری خۆی هەبوو:

ـ حەزدەکەم بابەتێك لەگەڵ ئێوەشدا بکەمەوە کە ماوەیەکە من و ڕەسوڵی بچووکی سەرقاڵ کردووە: هەزاران جار سوپاس بۆ ئەو خوایەی کە کەسانی باشی وەك ئێوەی کردووە بە دایك و باوکی مەعنەویمان. دیسان هەزاران ستایش بۆ ئەو خوایەی کە ڕاستییەکانی ئیمانی پێبەخشین و لە تاریکییەکان ڕزگاری کردین. کاتێك خزمەت و هەوڵ و کۆششی ئێوەمان بینی تێگەیشتین کە پێویستە گەورەترین ئامانجی مرۆڤ خزمەتی ئیمان و قورئان بێت. کەسانێکی زۆری موحتاج و بێتاوان و خەڵەتێنراو هەیە کە پێویستیان بەم حەقیقەتانە هەیە. ئەرکی ئێمە ئەوەیە بەوانی بگەیەنین. هەرچەندە کۆششکردن و ڕەزای خوا کرۆکی مەسەلەکەیە، بەڵام ئاستی خوێندەواری و بڕوانامە و باری کۆمەڵایەتیش کاریگەری خۆیان هەیە .

ماوەیەکی زۆرە بەم خەیاڵەوە دەژیم:

دەمەوێت سەر لەنوێ بەشداری تاقیکردنەوەی وەرگیران لە زانکۆ بکەم و دیسان کۆلێژ بخوێنمەوە. ئەگەر بتوانین حەزدەکەم لەگەڵ ڕەسوڵی بچووکدا پێکەوە ئەو کارە بکەین. ئیشەڵڵا بەو بڕوانامەیەمانەوە دەتوانین خزمەتێکی ئیمانیی باشتری کۆمەڵگا بکەین و بەو شێوەیە خەڵك زیاتر گوێمان لێ دەگرن .

لەوانەیە ئەمە بەلای ئێوەوە خەیاڵی بێت، بەڵام من بەدڵ ئەم داوایە لە خوا دەکەم. هەست دەکەم خوای گەورە لەو ڕێیەوە دەرگایەکمان لێ دەکاتەوە بۆ قەرەبووکردنەوەی هەڵە و تاوانە پێشینەکانمان .

بۆ ساتێك بێدەنگی باڵی کێشا. نە کاك ڕەسوڵ و نە مەدینەخان هەڵوێستێکیان هەبوو. خۆی لە خۆیدا ئەمە ڕەوشتی ئەوان بوو. سەرەتا بەجوانی گوێ دەگرن، پاشان گریمانەکان ڕیزدەکەن. کاك ڕەسوڵ سەرنجی لە من دا و، وتی:

– تۆ چی دەڵێیت ڕەسوڵ گیان؟

– مەدینەی بچووك خەیاڵێك پەروەردە ناکات باوەڕی پێی نەبێت. وزە و هەوڵ و فیداکاری لە ئەودا بە پلەیەکە دەرەقەتی هەموو ئاستەنگەکان دێت و دەیگەیەنێت بە گشت ئامانجێك. من بەم حاڵەمەوە کەڵکی خوێندنم پێوە نەماوە. کتێب بخوێنمەوە و بەشداری دەرسە ئیمانییەکان بکەم ئەوە بۆ من گەورەترین قازانجە. ئەمە وەکو خوێندنی زانکۆ وایە سەبارەت بە من. بەڵام هاریکاری و دوعاکانم لەگەڵ مەدینەی بچووك دەبێت. هەرگیز حەزناکەم لەناو چوار دیواردا خۆی زیندانی بکات و توانا و لێهاتووییەکانی کوێر ببنەوە. پێویستە توانا و بەهرەکانی مەدینە بەفیڕۆ نەچن. لەم ڕووەوە چی لە دەستمان بێت دەبێت بیکەین .

کاك ڕەسوڵ و مەدینەخانیش هاوڕای من بوون:

– پیرۆزبایی ئەو نییەتە پاك و هیوایەتە لە مەدینەی کچمان دەکەین و لە ناخی دڵمانەوە نزای سەرکەوتنی بۆ دەکەین. بێگومان هەموو هۆیەك

دەگرینەبەر بۆ فەراهەم کردنی ئەم بیرۆکە پیرۆزە. چونکە لەم سەردەمەدا و لە خزمەتی ئیمان و قورئاندا دەکرێت بروانامە و پلەوپایە و ناونیشان بکرێن بە هۆکار بۆ ڕزگارکردنی ئیمانی کەسانی تر. سەدان فەرموودەی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێت) چەشنی: " زانست بەدەست بهێنە، ئەگەر لە وڵاتی چینیش بێت. " ، " کەسێك دوێنێ و ئەمڕۆی لە یەك بچێت دۆڕاوە. " ، " فێری زانست ببن لە بێشکەوە تا گۆڕ "، بەرەو ئەم ڕاستییە ئاڕاستەمان دەکات .

بەڕاستی بە دڵ و بە گیان پیرۆزبایی لە مەدینەی کچمان دەکەین و داوا لە خوا دەکەین شەوق و حەزی بەردەوام بکات.

مەدینەخان باوەشی بە مەدینەی گچکەدا کرد و، وتی:

– تا تۆ خاوەنی ئەم دڵە پاکەبیت دڵنیابە خوای گەورە دەرگای سەرکەوتنت لە ڕوودا دەکاتەوە. ئێمەش شانازیت پێوە دەکەین ئیشەڵا!

بەزوویی خۆت بۆ تاقیکردنەوەکە ئامادە بکە کچم. ناو نووسین زۆری نەماوە. پشت بە خوا سەرکەوتوو دەبیت .

کاتێك مەدینەکەم ئەو پشتگیرییەی ئێمەی دیت خۆی یەکلایی کردەوە بۆ خوێندن. هەموو شتێك بە تیۆری ئاسان بوو، وەلێ کاتێك دەهاتە سەر جێبەجێکردن کارەکە زۆر گران دەبوو. دیسان ڕۆژانی سەخت لە پێشمان بوو.

بە هەموو شتێك ڕازی بووم. دەموت هەموو شتێکم فیدای ئەو کچەبێت کە ژیانی بۆ من تەرخان کردووە. چی لەوە خۆشتربوو بۆ من کە ئەو بە بەختەوەری و سەرکەوتوویی ببینم؟

بەڵام هێشتا کێشەیەکی تر هەبوو کە دەبوو چارەسەمان بکردایە. ئەو شەوە پێکەوە لەگەڵ مەدینەدا قسەمان لێ کرد.

هەنووکە ئێمە خێزانێك بووین. نەدەکرا لەوە زیاتر لەگەڵ ئەوان بمێنینەوە و ببین بە بار بەسەریانەوە. جگەلەوەش سەبارەت بە خوێندنی مەدینەش پێویستمان بە چەند ئامادەکارییەکی ماددی هەبوو. ئنجا لەبەر ئەوەی خێزانی مەدینە وایان دەزانی کچەکەیان خوێندنی تەواو کردووە و کار دەکات، پێویستبوو جاروبار هەندێك پارەیان بۆ بنێرێت. لەبەر هەموو ئەم هۆیانە دەبوو کارێك بدۆزینەوە بۆ پارە پەیداکردن، وەلێ چۆن؟

## ڕێگە چارەیەك

کاتێك ئێمە بە قووڵی بیرمان لەم بابەتە دەکردەوە، پێشنیارێکی جوانمان لە دۆستێکی نزیکەوە وەرگرت:

– هەوڵ بدەن کاتە بۆشەکانی ماڵەوەتان بە دروستکردنی بابەتی دیاری بەسەربەرن. ئەوەندە قازانجی دەبێت بەشی پێداویستییەکانی ئێوە بکات. یان دەتوانن بیر لە فرۆشتنی ئاو و شیرینی و گوڵ و کتێب و شتی لەو جۆرە بکەنەوە لە پارکێکی گونجاودا. ئەو چەشنە شتانە هەمیشە مشتەری بەردەوامیان هەیە. بەتایبەتی کتێب... چونکە هەم شتێکتان دەست دەکەوێت و هەم دەبن بە هۆی سوود وەرگرتنی کەسانی تر لەو

کتێبە بەنرخانە. ئێوە مادەم کەمئەندامیشن سەرنجی خەڵك ڕادەکێشن و ئەوەی پێویستی بە شتێك بێت لای ئێوە دەیکڕێت .

ئەم پێشنیارەمان زۆر بەلاوە باش بوو. هەم لە بێتاقەتی دانیشتن لە ماڵەوە ڕزگارمان دەبوو، هەم سوودێکمان بە خەڵك دەگەیاند و، شتێکیشمان بۆ خۆمان پەیدادەکرد.

کاتێك ئەم بابەتەمان لای کاك ڕەسوڵ و خێزانی کردەوە زۆریان پێ ناخۆش بوو:

- ئێوە ڕۆڵەی ئێمەن. زۆرمان پێخۆشە تا خوا مۆڵەتی تەمەن بدات لەگەڵ ئێوە پێکەوە بژین. هەرگیز لەم ماڵەدا غەریبە و بار و زیادە نین. بەلام بۆ ئەوەی ویژدانتان ئاسوودەبێت و حەزبکەن پارەی گیرفانتان خۆتان پەیدای بکەن، ئێمە هەموو جۆرە یارمەتییەکتان دەدەین. بەلام قەت نامێڵین لەم ماڵە بچنە دەرەوە .

سەرەتا هەموو شتێك وەك ئەوە چووە پێش کە نەخشەمان بۆ کێشابوو. کاك ڕەسوڵ لەگەڵ کەسانی لێپرسراو قسەی کرد و گۆشەیەکی لە پارکەکەی پشت ماڵی خۆمان بۆ دابین کردم. هەموو ڕۆژێك مەدینەکەم پاڵی بە خۆم و عەرەبانە و سندووقەکەمەوە دەنا و، منیش ئاو و شیرینی و کتێبم دەفرۆشت. بەلام ڕاهاتن بەو کارە هەروا ئاسان نەبوو. دیسانیش کارکردن و یارمەتیدانی ماڵەوە ئەگەرچی کەمیش بێت ئاسوودەی دەکردم. مەدینەش زۆر تێدەکۆشا و خۆی بۆ تاقیکردنەوەی وەرگیران لە زانکۆ ئامادە دەکرد .

## دەتوت دونیا بوومتە موڵکی ئێمە

لەکۆتاییـــدا ڕۆژی تاقیکردنـــەوە هاتـــە پـــێش. پـــاش هـــەوڵ و ماندووبوونێکی زۆری چەند مانگی، ئەو بەیانییەی کە پێکەوە دەچووین بۆ ئەو جێیەی تاقیکردنەوەکەی لێ دەکرا، بەکوڵ و بەدڵ دوعامان دەکرد:

- خوایەگیان! ئێمە هەموو هۆکارەکانمان بەکارهێنا و دوعای کردەیـی خۆمان کرد. ئەوەی لەسەر ئێمەبوو کردمان و خۆمان مانـدوو کـرد. ئێسـتا داوای باشترینت لێ دەکەین بۆ دنیا و قیامەتمان. ئەگـەر خێـری تێـدا نییـە ئاستەنگی بخە پێش و بەنسیبمانی مەکە.

مەدینە ڕۆیشت، بەڵام من دڵەتەپێم لەو زیاتربوو. دەتـووت ئێسـتا نـا ئێســتا دڵــم دێتــە دەرەوە. خولەکــەکانی تاقیکردنــەوە تێنەدەپــەڕین. دەترسام و جێم بەخۆم نەدەگرت لە ماڵەوە .

لەبەر دەرگا مەدینەی گچکەم بەڕێ کـرد . تـا هاتـەوە لـە جێـی خـۆم نەبزوام. ڕاستتر بڵێین دڕدۆنگی و جۆش و خرۆش کلیلیان دا لە چـوارپەلم و نـەمتوانی بجووڵێمـەوە. ئـەو ڕۆژە کـاك ڕەسـوڵ و خێزانـی بـۆ کارێـك ناچاربوون بچن بۆ دەرەوەی شار و من لە ماڵەوە بە تەنیا مابوومەوە.

نازانم چەند جار دوعای (الجوشن الكبير)م خوێندەوە و دوعاكانی ناویم چەند بار دووپات كردەوە.[1] هەزاران جار لە خوای میهرەبان پاڕامەوە .

دەتووت چەندەها سەدەی پێچوو تا ئەو ساتەی كە مەدینە هاتەوە و دەرگاكەی كردەوە .

خێرا سەرنجم لە چاوە جوانەكانی مەدینەكەم دا كە هەرگیز زەردەخەنەیان لێ نەدەتۆرا. ویستم نیگاكانی بخوێنمەوە، چونكە هەموو چاو داخستنێكی ئەو پەیامێكی تایبەتی تێدابوو .

بەڵێ، پێدەكەنی. خۆشی ناخی دەپرژایە دەرەوە. حاڵی بە جۆرێك بوو وەك ئەوەی بڵێت: " سوپاس بۆ خوا ئەم كارەش تەواو ". وەستان و پێكەنینی شەرمنانە و نیگاكانی، بەقەدەر ناواخنی چەندەها كتێب مژدەیان دەدا. دیسان هەردووكمان گریاین و پڕ بە دڵ سوپاسی خوامان كرد .

---

١- " جەوشەن " واتە: ئەو زرێ یەی كە لە جەنگدا لەسەر سنگەوە دەپۆشرێت. بەڵام لێرەدا مەبەست ئەو موناجاتە ڕەنگینەی پێغەمبەرە ( دوودی خوای لەسەربێت ) كە بە ڕیوایەتی ئیمام " زەینولعابیدین " ـ خوا لێی ڕازی بێت ـ دەماودەم ڕیوایەت كراوە و، لاڵانەوە و موناجاتێكە بە سیفاتە مەزن و ناوە جوانەكانی خوای گەورە و، لە نێوان هەموو بڕگەیەكیدا ئەم دەستەواژەیە دووپات دەبێتەوە: ( سبحانك لا اله الا انت الئمان الئمان اجرنا من النار.. خلصنا من النار.. نجنا من النار).

ئەمە لە هەموو مژدەیەك خۆشتربوو. مەدینە بچۆلانەکەم پاش ئەو هەموو ئازار و ناڕەحەتییە، هەوڵی زۆری دا و خۆی ماندوو کرد. ئەمەش بوو بە هۆی کرانەوەی دەرگای ڕەحمەت و بەخشندەیی خوای گەورە. بە چاوی خۆمان ڕاستی وتە بەنرخەکەی کاك ڕەسوڵمان بینی: " ئێوە پلانی ڕۆژانە دابنێن و لێی لامەدەن. بە دڵ داوای شتێك بکەن و بە ژیریشتان جوڵەبکەن، هەرگیز خوای گەورە بەندەیەکی لەم جۆرە مایەپووچ و دەستخەڕۆ ناکات."

ئەو ڕۆژەی کە ئەنجامی تاقیکردنەوەکەمان وەرگرتەوە سەدان جار سوژدەی شوکرمان برد. کاك ڕەسوڵ و خێزانی لە ئێمە زیاتر پێیان خۆش بوو. کاك ڕەسوڵ پێدەکەنی و، دەیوت: " کەواتە دەبین بە هاوپیشە، ها؟."

ئەنجام: کۆلێژی پزیشکی...

## تەنها مابووینەوە

دەمانزانی کە لە سەرەتای ڕێگایەکی دوور و درێژ و پڕ لە شەکەتیداین. دەشمانزانی کە بەربەستی گران لەڕێماندایە و بە زەحمەت دەبڕرێن. بەڵام لە سایەی لێبڕان و ویست و کۆششی مەدینەوە، دەشمانزانی کە پشت بە خوا سەرکەوتوو دەبین. چونکە سەرکەوتن بۆ ئەو کەسانەبوو کە بڕوای پێدەکەن. ئەم باوەڕەش بە زیادەوە لە مەدینەدا هەبوو.

لەکاتێکدا ئەم جوانییانە دڵیان لێوانلێو دەکردین لە خۆشی، ئاگامان لە دیمەنە سەخت و تاڵەکانی ژیان نەبوو. تیشکێك لە دەروونماندا هەڵهاتبوو، وەلێ بە چیدا بمانزانیایە کە یەك لەدوای یەك تاریکییەکان هێرش دەهێنن و ڕۆژمان دەکەن بە دەیجوور؟ ڕێك وەك حاڵی ئەو ئاسکەی کە بێئاگایانە دەلەڕەوێت و خەبەری لەو شێرە دڕندەیە نییە کە خۆی بۆ مەڵاس داوە...

کاك ڕەسوڵ و مەدینەخان داوایان لێ کرابوو کە بە مەبەستی خزمەت کردنی ئیمان و قورئان بچن بۆ وڵاتی یابان. بڕیاربوو چەند ساڵێك لەوێ بمێننەوە. ئەم دوو مرۆڤە فیداکارەی کە سینەیان هێندەی دەریاکان فراوان و هیوایان بەقەدەر ئاسمانەکان بەرینبوو، زێد و ماڵ و حاڵی خۆیان جێدەهێشت و کۆچیان دەکرد لەپێناو خزمەتکردنی ئەو ئیسلامەی کە بەخێراییەکی سەرسووڕهێن لەو وڵاتەدا تەشەنەی دەکرد. دەچوون لەوێ لە ڕێگەی خوێندن و خوێندەوارییەوە ئەو ئیسلامەی کە هەموو میللەتان لە باوەش دەگرێت، پێشکەش بە گەنجانی جددی و کارزان و عەودالانی ڕاستی و حەق بکەن. لە هەمووشی گرنگتر بە ژیان و هەڵسوکەوتیان دەریان دەخست کە ئیسلام دینی چەك و بۆمب و خوێن نییە و، دوور و نزیك پەیوەندی بە تیرۆر و ئاژاوەوە نییە. شەو و ڕۆژیان دەخستە سەریەك لەپێناو ئەم ئامانجەدا.

پێویست بوو لەبەر خاتری ئەم پەیام و بیرۆکە مەزنە وڵات بەجێبهێڵن. ئێمەش هەوڵمان دەدا خۆمان لەگەڵ نەبوونی ئەواندا ڕابهێنین و لەسەر پێی خۆمان بوەستین. بێگومان ئەمە سەخت دەبوو بۆ ئێمە.

ماڵەکەیان بۆ ئێمە جێهێشت. چەندین جار دۆست و هاوڕێکانیان ئاگادارکردەوە کە ئاگایان لە ئێمە بێت .

ماڵئاوایی و جیابوونەوە زۆر گران بوو. چەندین کاتژمێر هەردوو لامان فرمێسکمان ڕشت. بەتایبەتی فرمێسك و هەنسکەکانی مەدینەخان دڵمانی کرد بە ئاو:

- ڕۆڵەکانم، مناڵەکانم! ئێوەمان لە دڵماندا هەلگرتووە و لەگەڵ خۆمان دەتانبەین. ئەگەر بەرگەی ئەم جودابیەم نەگرت، بزانن کە لە دەرگای گۆڕەکەمدا چاوەڕێتان دەکەم. لە خوای گەورە داواکارم لەگەڵ ئێوەدا بەختەوەری هەمیشەییمان پێببەخشێت. ئەگینا بێ ئێوە، ئێمە هەرگیز هەست بە ئارامی و ئاسوودەگی ناکەین.

بەڕاستی ئەمە خۆشەویستی و میهرەبانییەکی بێوێنەبوو! ئەم ئافرەتە فریشتەئاسایە هەروەك چۆن دنیای بەخت کرد لەپێناو ئێمەدا، بەهەمان جۆر ئامادەبوو دوارۆژیشی فیدا بکات.

بۆ تێگەیشتن و گەیشتن بەم نهێنییە و پەی بردن بەم ڕازە، پێویستە دڵ لێوان لێوبێت لە خۆشەویستی خوایی. چەشنی حەزرەتی ئەبوبەکر کە دەفەرموێت: "خوایە گیان جەستەی من لە دۆزەخدا هێندە گەورە بکە، جێی موسوڵمانێکی تری تێدا نەبێتەوە". یان سەعیدی نوورسی کە

دەفەرموێت: "گەر ئیمانی میللەتەکەم پارێزراوبێت، ئامادەم لە بڵێسەی دۆزەخدا بسووتێم. چونکە کاتێک جەستەم دەسووتێت، دڵ و ویژدانم دەبێت بە گوڵ و گوڵستان..."

ئیتر تەنها بووین لە بەرامبەر هەموو مەترسی و گشت تەڵە فریودەرەکاندا. پیاوێکی ئیفلیج کە قەدەری بەستراوەتەوە بە عەرەبانەیەکەوە، لەگەڵ ژنێکی بێکەسی کەمئەندامدا...

ماف و دادپەروەری ئاوا دەبێت؟

بڕیاربوو ئەو ڕۆژە خوێندنی زانکۆی مەدینە دەست پێبکات. بە جۆش و خرۆشێکی زۆرەوە لە ماڵ چووە دەرەوە. یەکەم ڕۆژی ماراسۆنێکی دوور و درێژبوو. نازانم بۆچی، وەلێ دڵم تەنگ بوو کاتێك ماڵئاواییم لێ کرد.

هێشتا چەند سەعاتێکی نەبردبوو کە بە ڕوخساری تاڵ و دەموچاوی هەڵبزڕکاوەوە گەڕایەوە. ئەگەر ئەوە ڕووداوێکی ئاسایی بووایە هەرگیز نەیدەهێشت من هەستی پێبکەم. مادەم وایە، کەواتە شتێکی زۆر گرنگ ڕووی داوە .

زۆر ترسام. بە ماندوویی خۆی لەسەر قەنەفەکەی تەنیشتم هاوی. دەستی گرت بە ڕوویەوە و کەوتە گریان. وتم:

ـ بۆ خاتری خوا، چی بووە بیڵێ؟

ـ چی خەونم هەبوو دەربارەی خوێندن و زانکۆ هەمووی تەواو. ئەو هەمووە خۆم بۆ ئامادەکرد، بەڵام نەبوو ئیتر! نەبوو!

ـ توخوا چی بووە؟ پێم بڵێ تکات لێ دەکەم!

- چی بڵێم؟ وەریان نەگرتم!

بۆ ساتێك سەرم گێژی خوارد و، هەناسەم تەنگ بوو و، تەزووی سارد بە گیانمدا هات. پرسیم:

- سەبەب؟

بەدەم گریانەوە وتی:

- لەبەر ئەوەی سەرپۆشم کردووە...

ئەو دوو وشەیە وەك بۆمبێك لە سەری مندا تەقینەوە. بەجارێك بیرمیان پارچە پارچە کرد. نەمزانی چی بڵێم. بەتەواوەتی خەیاڵ و ئاواتەکانم شکان. دەتوت لەپڕێکدا ئەو ژوورەی کە تێیدابووین بوو بە چاڵێك لە ئاگر و مەدینەش تێیدا پەلەقاژەیەتی. بینینی گریان و ناڵەی ئەو ئازارێك بوو بەشی ئەوەی دەکرد ڕۆحم لە لاشەم جویێ بکاتەوە. ئەوەندە لە خۆمدا ونبووم کە لە هەمبەر نرکە و نووزەی ئەوەوە نەمدەتوانی وشەیەك بڵێم. هاواری دەکرد و، دەیوت:

- من بە داپۆشینی قژم زەرەرم بۆ کێ هەیە؟ باڵاپۆشی من فەرمانێکە لای خواوە بۆم هاتووە. هەرگیز نیشانە و پەیامێکی سیاسی نییە. بۆچی ئەم دوو شتە جیاوازە تێکەڵاو دەکەن؟ بۆچی بەرگێکی سیاسی بە بەری سەرپۆشێکی سادە و ساکار دەبڕن؟ قەت ناتوانم لەم لۆجیکە تێبگەم. بۆچی باڵاپۆشی سەرپێچی بێت لە نیشتمان و نەتەوە؟ بۆچی نایانەوێت لەمە تێبگەن؟

سەرپۆش کردن، خۆجیاکردنەوە و جوداخوازیش نییە. لە نێوان نزیکترین هاوڕێکانمدا هەیانە بالاپۆش نین. هیچ کێشەیەکیشمان لەگەڵ یەکتردا نییە .

ئەمڕۆ بە بەرچاوی خۆمەوە کچێکیان کردە ژوورەوە جلی کورت و تەسکی پۆشیبوو، کەچی ڕێگرییان کرد لە من و ئەوانەی وەك من وابوون. باشە، جلوبەرگی ئەو کچە لەگەڵ چ کلتور و چ داب و نەریتێکمان گونجاوە، یان خزمەت بە کام ئامانج لە ئامانجەکانی سیستەمی خوێندن دەکات و، جلەکانی من پێچەوانەیە و زیان دەدات؟! جلوبەرگی من جلی پێشینان و ئەو مرۆڤانەیە کە شانازییان پێوە دەکەین... نازانم چۆن لەمە تێبگەم؟

ئەمە بە زۆر دوژمنایەتی خستە ناو خەڵك و کۆمەڵگەیە، بە ئامانجی ئەوەی خەڵکی بکرێن بە دەستە و تاقمی جیاوازەوە پاشان بدرێن بە یەکدا .

ئاخر بۆچی ئەم هەڵەیەمان بەرامبەر دەکەن؟ بۆچی ئەوەندە لەو سەرپۆشە دەترسن؟ ئەگەر یەکێك هەبێت بالاپۆشی بۆ مەبەستی خراپ بەکاربهێنێت، دەوڵەت دەزگای زانیاری کۆکردنەوە و پاراستنی ئاسایشی هەیە، بفەرموون ئاشکرایان بکەن، ئێمەش یارمەتیدەریان دەبین. بەلام واز لەو کەسانە بهێنن کە ئیمانی ناو دڵیان فەرمانی خۆداپۆشینی بۆ دەرکردوون و لەپێناو ئارامی دەروونی خۆیان و بەهای کلتووریدا بالاپۆشن.

ئەوەندە کاری لە مەدینە کردبوو نە هـاوار و فـەریادی دەنیشـتەوە و نە کوڵی دڵی هێوردەبووەوە. بیرم نایەت هیچ ڕووداوێك هێنـدە شـێلابێتی. تەنانەت ئەو کاتانەی کە پێکەوە دەیانبردین بۆ ئەوەی بمانکوژن، ئەوەندە نەڕووخابوو.

چەندین ڕۆژ بەم کارەساتە تاساین. چەندین ڕۆژ باسمان کرد و بیرمان لە ڕێگەچارەیەك کردەوە. بەڵام نەبوو و نەبوو. مەدینەی هەژاریش بوو بـە قوربانی ستەمێکی قێزەون وەك هەزاران کچی بێتاوانی تر. دڵ پڕ خەفـەت و چاو بە گریان ...

## ناچاربوو واز لە خوێندن بهێنێت

مەدینە ئەوەندە پارێزکار و پابەندبوو بـە خـوای خۆیـەوە ڕازی نـەبوو بـەوەی سـەری ڕووت بکـات یـان بـە قـژی دەسـتکرد قـژی بشـارێتەوە. دەمانزانی کـە هەنـدێك بـە ناچـاری لـە نێـوان دوو شـەڕدا دەبـوو ئـەوەیان هەڵبژێرن کە ئەهوەنترە و، ناچاربوون بۆ ئەوەی داهاتوویان نەفـەوتێت و، لـە دواڕۆژدا بـبن بـە مایـەی خێـری گـەورەتر، باڕوکـە لـە قـژیان ببەسـتن. مەدینە بەمەش ڕازی نەبوو. من ویسـتم قەناعـەتی پێبکـەم. چـەندین جـار پێم وت کە بەناچاری ساڵانی زانکۆ باڕوکە لەسەرکات و دواتر دەتوانێت لە نەخۆشخانەی ئەهلیدا خۆی داپۆشێت. لـەم ڕێیـەوە دەتوانێـت ببێـت بـە هۆکار بۆ چەندەها خێری گەورەتر. بەڵام ئەو سووربوو لەسـەر بڕیارەکـەی و، وتی:

ـ نەخێر. لەوانەیە ئەوە بۆ هەندێك ڕێگەچارەبێت. لەوانەیە بۆ هەندێك بەڕاستی ناچاربن و هەڵبژاردنێکی تریان نەبێت. من هیچ جۆرە ناکۆکییەکم لەگەڵ ئەوانەدا نییە. خۆی لە خۆیدا ئەگەر ڕێی تریان هەبووایە قژیان ڕووت نەدەکرد. وەلێ من ناتوانم ئەوە بکەم. دوای ئەو هەموو نیعمەت و ڕێزلێنانە تایبەتییە خواییانە ناتوانم زیان لە هەست و نەستم بدەم. پشتگیری ئەوانە دەکەم کە ناچارن لە نێوان دوو شەڕدا ئەهوەنەکەیان هەڵبژێرن و هەمیشە دوعایان بۆ دەکەم. خوا پشت و پەنایان بێت. بەڵام من هەرگیز ناتوانم ئەوە بکەم.

بڕیاری یەکجاری دابوو.

جۆش و خرۆش و دڵەپێی و ترسی تاقیکردنەوە کە بەدرێژایی ساڵێك هەموو ڕۆژێك و هەموو شەوێك، هەموو سەعاتێك و تەنانەت هەموو ساتێك ژیانی لە مەدینە تاڵ کردبوو، بەکۆتا گەیشت. هەموو خولیا و ئاواتەکانیشی سەبارەت بە خوێندن گەیشتن بە پایان. بەڵام هێشتا تاقیکردنەوەی سەختی ژیانی ئێمە و بگرە و بەردەکانی تەواو نەبووبوون. بەجۆرێك یەکێکیان تەواو نەدەبوو کە ئەوی دی دەستی پێدەکرد.

ڕۆژێکیان لەگەڵ مەدینەدا وەك ڕۆژانی تر چووین بۆ پارك بۆ جێگای هەمیشەیی خۆمان. منی جێهێشت و خۆی گەڕایەوە بۆ ماڵەوە بۆ لای چەند کچێك کە وانەی ئیمانی پێدەوتنەوە. منیش کەوتمە سەر ئەو کارەی کە هەموو ڕۆژێك دەمکرد. هەوڵم دەدا کتێب بەو کەسانە بفرۆشم کە هاتوچۆی پارکەکەیان دەکرد، بەتایبەتی گەنجان.

# بەشی دەیەم



## ڕابردووم بەرۆکی بەرنەدەدام

کابرایەکی بالآمامناوەندی لێم نزیك بووەوە و، وتی:

- خوا قوەتت بدات ئامۆزا!

وتم سوپاس و لەو ساتەدا چاومان بەیەکدا هەڵتەقی.

لە ڕوخساریدا نهێنییەك هەبوو کە لێی تێنەدەگەیشتم. هەستم بە هەوڵێکی شەیتانانە دەکرد بۆیە ترسێکی سەیر خۆی خزاندە دڵم. بە لاقرتێوە وتی:

- ئەم کتێبانەی دەیفرۆشیت هەمووی دینین برالە. کتێبی عەشق و مەشقت نییە؟ ئەم سووکایەتییەم زۆر پێناخۆشبوو. کابرا نیەتی کتێب کڕین نەبوو، بەڵکو بەئاشکرا دەیویست پێم ڕابوێرێت. بەڵام من دیسانیش ویستم خۆڕاگریم. وتم: برای بەڕێزم، لەوانەیە تۆ پێش خوێندنەوەی کتێبەکان بڕیارت دابێت. لەم کتێبانەدا خۆشەویستی و پەیوەندی خێزانی

و ڕووداوەکـان هـەموویان ڕاسـتەقینەن. دڵنیـام ئەگـەر بیخوێنیتـەوە زۆر بەدڵت دەبن.

لێم نزیک بووەوە و، وتی:

ـ ئاوا؟

یەک دوو خولەک لە بەردەممدا خۆی خڵەفاند. پاشان بەهێواشی چووە دواوەم و لەپڕ ئازارێکی تیژم لە پشتمدا هەست پێکرد. پـێش ئـەوەی بـە خۆم و عەرەبانەکەمەوە ئاوڕ بۆ دواوە بدەمەوە، بەلای چاو بینیم پیاوەکە هەڵهات. بەڵام ئازارەکە لە ساتێکی کەمدا بـە گشـت لاشـەمدا بڵاوبـووەوە. هەموو گیانم وشك بوو. ئەو بڵێسەیەی لە پشتم بەرزدەبووەوە گەیشـت بـە مێشـکم. هۆشـم وەسـتا و لـە چـەند چـرکەیەکدا تلێربوومـەوە بـۆ نـاو تاریکییـەکی نادیـار. لـە دوایـین سـاتدا بـیرم دێـت لـە دڵـی خۆمـدا وتم: "لەوانەیە ئەمە مردن بێت، با شایەتومان بێنم ". ئـیتر دوای ئـەوە هیچـی ترم بیرنایەت .

دیسان چاوم لە نەخۆشخانە کـردەوە. کەسـانێکی زۆری نەناسـراو لـە دەوروبـەرم بـوون. هـەمووی بـە مەراقـەوە چـاویان لـێ دەکـردم، وەلێ مەدینەکەم لەناویاندا نەبوو. هەوڵم دەدا بزانم داخۆ دنیایە یان دواڕۆژ.

پزیشکێکی لاو هات بۆ لام و، وتی:

ـ کەفارەتت بێت کاکە. ماشەڵڵا باش ڕزگارت بووە. پێویست بە تـرس ناکات. بە سەرسوووڕمانەوە پرسیم:

ـ چیم بەسەر هاتووە؟ کێ هێناومی بۆ ئێرە؟

لامەوە دانیشت و دەستی نایە سەر شانم:

ـ سەیرکە کاکە، لە ژیاندا پیاو دۆستی هەیە و دوژمنیش. دیارە تۆ بەم حاڵەشتەوە هێشتا دوژمنت هەیە. سەری داخست، نەیزانی چۆن بەردەوام بێت. پاشان پچڕ پچڕ دەستی کرد بە قسە:

ـ دوو گەنج تۆیان بە بووراوەیی لە ناو پارکێکدا دۆزیوەتەوە. کاتێك هێنایانیت حاڵت مەترسیداربوو، وەلێ جەستەت خۆی ڕاگرت. پاشان بەشێوەیەك کە ئێمە چاوەڕێمان نەدەکرد چاوەکانت هەڵهێنا.

ـ باشە چی بەسەر من هاتووە؟

ـ ئێمەش دەمانەوێت ئەوە بزانین. ئەوەی دەیزانین ئەوەیە کە ژەهرێکی کاریگەریان کردووەتە جەستەتەوە. لە خواییەوە دڵت باش بەرگەی گرتووە. بەگشتی ئەو جۆرە ژەهرانە زوو مرۆڤ دەکوژن.

ـ بەڵێ. بە شریقەیەك ژەهریان لێدام. بیرم دێت پشتم وەك بسووتێتەوە وابوو.

ـ ڕاستە، زانیویشیانە بیدەن لە کوێ. بەهەرحاڵ، خوا شیفات بدات. سەرەتا ئێمەت ترساند، وەلێ دواتر موعجیزەیەکمان بە چاوی خۆمان بینی. دیارە خوای گەورە تۆی جارێکیتر بەخشیوەتەوە بە خۆشەویستانت...

## بوو بووم بە پارچە گۆشتێکی زیندوو

هێندە بەئاسانی ئەو کارەساتەم بەسەردا تێنەپەڕی. خۆم لە خۆمدا کەمئەندام بووم و لە ناوکم بەرەوخوار ئیفلیج بوو. بە کاریگەری ژەهرەکە

قۆڵی ڕاستیشم وشك بووبوو. قۆڵی چەپیشم بەزۆر جووڵە پێدەکرد. واتە تەرمێکی زیندووی یەك قۆڵ بووم. تەنانەت بەم حاڵەشمەوە چڕنووکی خوێناوی ڕابردوو یەخەی بەرنەدەدام. دوعام دەکرد و، دەموت: " ئەی خوای میهرەبان! کەواتە گوناهەکانم ئەوەندە زۆر و گران و چەپەڵن کە ئەم هەموو بەڵا و کارەساتە یەك لەدوای یەکانە ناتوانن بمشۆنەوە و پاکم بکەنەوە. کەوایە تاقیکردنەوەی ژیان زۆر لەوە سەختتر و گرانترە وەك لەوەی چاوەڕێم دەکرد ."

بە تەلەفون مەدینەیان ئاگادارکردەوە. کاتێك منی لە پارکەکەدا نەدیوەتەوە کەوتووەتە پەلەقاژە. خێرا هات بۆ لام و وەك هەمیشە لە ترسی ئەوەی من شتێکم لێ هاتبێت گیانی وەك شەقشەقە دەلەرزی.

بەڕاستی من ژیانی هاوبەشم لەگەڵ کچێکی بێوینە پێکهێنابوو کە لە دنیادا هاوشێوەی نەبوو. جارێکی تریش ئەمەم بەجوانی بۆ ڕوونبووەوە. سوپاس بۆ ئەو خوایەی کە ڕێم لە کچێکی خۆرهەڵاتی کەوت کە بێجگە لە ئیمان و خۆشەویستی هیچی تری لە دڵدا نەبوو. من لە دڵی ئەودا ژیانێکی هەمیشەییم دیتبووەوە کە وەکو دەرمانێکی جادوویی هەموو ژیانی شیرین دەکرد.

تەمەنێکی پڕ ئازار و ئەشکەنجە، بەقوربانیبوونی لاوێتی لەڕێی هەڵە و چەوتدا، خەم و خەفەتی نەدەدامێ. کاتێك من لە تەنیشتمەوە کەسێکی وا هەیە کە خۆشیدەوێم، ئیتر چ مافی سکاڵا و ناڕازیبوونم هەیە؟ لە ڕێی

سەخت و تەماویی و ناخۆشیی ژیاندا، ئەوبوو تەنها سەرمایە و سەرچاوەی هیوا و دەوڵەمەندیم.

داوام دەکرد کە خوای گەورە لە تەمەنی من هەڵبگرێت و بیخاتە سەر تەمەنی ئەو. ئەو ئازارەی بۆ ئەو دێت بە نسیبی من بێت و ئەو دوعایانەی بۆ ئەوی دەکەم خوا لێمی قبوڵ بکات.

هێشتا لە کاریگەری ئەم ڕووداوەی بەسەرمان هات ڕزگارمان نەبووبوو، کاتێك سەرلەنوێ ڕەشەبای ژیان لە شوێنێکی ترەوە هەڵی کرد و شڕ و شیتاڵی هەڵگرتین. وەلێ ئەم جارە زۆر جیاواز هەڵیکرد. ڕووداوێکی نهێنی و ڕازئامێزبوو کە ژیریمان لە شیکارکردنیدا دەستەوسان بوو.

ئای خوایە گیان!

ئەو ڕۆژە وەك هەموو ڕۆژێکی تر مەدینە منی لە پارکەکە دانا. خۆیشی بە مەبەستی کڕینی خواردن پەڕیەوە ئەوبەری شەقامەکە.

پاش چەند چرکەیەك دەنگی توندی ئیستۆپ هات و بەدوایدا قیژە و هات وهاوار...

کسپەیەك بە دڵمدا هات. بەترس و سەرسامییەوە چاوم لە پەنجا مەتر ئەولاتر بڕیبوو. قەرەباڵغی، ڕاکەڕاك و ئەمبولانس... لەبەر قەرەباڵغی نەمدەزانی چی ڕووی داوە، وەلێ دیاربوو کە سەیارە لە یەکێکی داوە .

پۆلیس خێرا بەو ناوەدا بڵاوبووەوە .

چونکە مەدینە هێشتا نەهاتبووەوە نەمدەزانی چی ڕووی داوە .

بەداخەوە زۆری نەبرد ئەو هەواڵە جەرگبڕە گەیشت. گەیشت و دنیـای کەمئەندامی منی شێواند.

کەوایە کسپەی دڵ و بڵێسەی ناخم لە خۆڕایی نەبووە.

ئـەو کەسـەی سـەیارە لێـی داوە هەناسـەی ژیـان و تاقـە ئومێـدم: مەدینەکەم بووە.. کاتێك هەواڵەکـەیان پێگەیانـدم هەسـتم کـرد ڕۆحـم لـە جەسـتەم جـوێ دەبێتـەوە. سـوێند بـەخوا ئەگـەر بیانوتایـە: "وەرە، بـۆ سێدارەت دەبەین"، ئـەم هەواڵـە لـە چـاو ئـەو خەبـەرەی پێیـان دام هـیچ نەبوو. ئەگەر شتێك بەسەر ئەو بێت تەنها مانای ئەوە نییە کە من دەمـرم، بەڵکو لە هـەمان کاتـدا مـەحروم بـوونی سـەدان گـەنج بـوو کـە موحتـاجی خزمەت و میهرەبانی و خۆشەویستی ئەون و، وانەی ئیمانی و قورئانییان لا دەخوێنـد. کاتێـك بـیرم لەمـە دەکـردەوە وشـك دەبـووم و لـە خەفەتـدا لێوەکانم دەگەست. ئەو دەمەی مەدینەکەم چاوەڕێی پەڕینـەوەی کـردووە لـە ترافیـك لایتـدا، منـاڵێکی پێـنج سـاڵان بـێ سـەیرکردنی ئـەملاولا پەڕیوەتەوە. مەدینەش بۆ ڕزگارکردنی شوێنی کەوتووە. قـۆڵی منداڵـەی گرتووە، وەلێ سەیارەیەکی خێرا تایەکانی پێشەوە و دواوەی لای ڕاسـتی، قاچە سـاغەکەی شـێلاوە ... خێزانـی مناڵەکـە بەپەلـە هاتوونەتـە سـەری. خێرا فڕاندوویانە بۆ نەخۆشخانە. بەدوایدا منیشیان برد .

مەدینەکەم دوو مانگ لـە نەخۆشـخانە کـەوت و دوو نەشـتەرگەری بـۆ کـرا. پاشـان گەڕاینـەوە بـۆ ماڵـەوە، وەلێ هـەردووکمان پێویسـتمان بـە چاودێری هەبوو. سوپاس بۆ ئـەو خوایـەی کـە هـەموو دەرگاکـان بـەڕووی

بەندەکانیدا داناخات. هەمیشە دەرگایەکی هیوا بەکراوەیی دەهێڵێتەوە و هەردەم ڕێیەك نیشانی بەندەکانی دەدات. ئەوەی ئێمەش هەروابوو. ئەو کاتەی ئێمە وامانزانی زستان باڵی بەسەرماندا کێشاوە، لە دوورەوە تروسکایی بەهارێکی نوێ بینرا.

ئەم ڕووداوە نیشانی داین کە هەموو نەخۆشی و کارەساتێك ڕوویەکی ناشیرینی دیاری هەیە، بەڵام ڕوویەکی نادیاری شیرینیشی هەیە...

خوای گەورە لە هەندێك بەڵادا خۆشی و لە هەندێك خۆشیدا بەڵای حەشارداوە. لەم ڕووداوەدا کە ژیانمانی سەروژێرکرد هەردوو ڕووی جوان و ناشیرینمان بینی. چەشنی ئەو کارە قورسانەی کە دیاری بەنرخیان لە بەرامبەردا دەدرێت، یان وەکو سەرکەوتن لە دوای تاقیکردنەوەی سەخت و ماندووکەر.

خێزانی ئەو منداڵەی کە مەدینەکەم ڕزگاری کرد بۆ ساتێك بە تەنها جێیان نەهێشتین. بۆمان دەرکەوت کە خوای گەورە بە قەڵەمی قەدەر نەخشاندوویەتی کە ئەم ڕووداوە ببێت بەهۆی یەکترناسین و پەیوەستبوونی دڵمان پێکەوە .

ئەو خێزانە دانیشتووی هەندەران بوون و بۆ پشوویەك گەڕابوونەوە بۆ وڵات... دوای پازدە ساڵ هاوسەرگیری و پاش چارەسەرێکی دوور و درێژ کوڕێکیان بووە. بۆیە منداڵێکی زۆر خۆشەویست و نازداربووە بەلایانەوە. لەبەر ئەمە ئەوەندە منەتبار و قەرزاری مەدینەبوون بۆ ساتێك بەجێیان نەهێشتین .

# بەشی یازدەهەم

## کۆتایی نەهامەتی

هاتن بۆ ماڵمان بۆ سەردان و گوێیان لە سەربوردەی ژیانمان گرت و زۆر کاری لێکردن. ئایسون خان لە سایەی هاوڕێیەتی و وانەکانی مەدینەکەمدا بەگەرموگوڕی دەستی کرد بە نوێژکردن. لەگەڵ مەدینەدا ئەوەندە یەکتریان خۆشدەویست و پەیوەست بووبوون لەیەکتر جیانەدەبوونەوە. کاک هاروونیش زۆر پیاوێکی باش بوو. کەسێکی دەوڵەمەند و دارا بوو. جگە لەوەش بازرگانێك بوو لە دەرەوەی وڵاتەوە کەلوپەلی بازرگانی دەهێنا.

ئەو خێزانە نەیاندەویست وازمان لێبهێنن. ویستیان بمانبەن بۆ هەندەران بە مەبەستی چارەسەرکردنی من و خوێندنی زانکۆی مەدینە. پاش گفتوگۆیەکی زۆر ڕازی بووین، بەڵام بەو شەرتەی کە دواتر وردە وردە پارەکەیان بدەینەوە.

ئـەوان گەڕانــەوە بـۆ دەرەوەی وڵات. کاروبـارە فەرمییـەکان چـەند مانگێکی پێچوو. پـاش ئـەوە ئێمـەش چووین. بـەم شـێوەیە لاپەڕەیـەکی نوێی ژیـان لەڕوومانـدا کرایـەوە، بـەجۆرێك کـە بـە خەیاڵمانـدا نـەهاتبوو و حسابمان بۆ نەکردبوو. ئەمەش لەدوای ڕووداوێکی ناخۆش.

من لە چارەسەری خۆم زیاتر حەزمـدەکرد مەدینـە بخوێنێـت. بـاوەڕم وابوو بە هەوڵ و خۆڕاگرییەکەی دەتوانێت سەرکەوتووبێت .

ئەو خێزانە باشە بە هەموو جۆرێك خزمەتیان دەکـردین. یەکـەم هـۆی ئەمـە ئـەوەبوو کـە مەدینـە منداڵەکـەیانی ڕزگـارکردبوو، دووهـەم هـۆش ئـەوەبوو کـە دیسـان بـەهۆی مەدینـەوە ئاڕاسـتەی ژیانیـان گۆڕابـوو بـۆ ژیانێکی مەعنەوی جوان و ڕەنگین.

مەدینـە بـۆ بـەهێزکردنی زمـانی بیـانی سـاڵێك کۆرسـی ئامادەکـاری خوێند. پاشان دەستی کرد بە خوێنـدن. ئەگـەر هـەموو شـتێك وەك خـۆی بچووایەتە پێش، بڕیار وابوو لە بواری ڕاگەیاندنـدا بخوێنێـت. چارەسـەریی منـیش بـەردەوام بـوو، وەڵێ چـاوەڕوانی گـۆڕانێکی زۆری لـێ نـەدەکرا. نەمدەتوانی قۆڵ و دەستی ڕاستم بجـووڵێنم. دەبـوو ڕابـێم بـەوەی کـە بـە یەك دەستەوە بژیم.

## ژیانی تاراوگەی مەدینەم

مەدینە لە لایەك بە هـەموو توانـای دەیخوێنـد و لـە لایـەکی تریشـەوە بووبـوو بـە نموونەیـەکی جـوان بـۆ موسـوڵمانێتی و بـاوەڕداری. شـەممان وانـەی قورئـان و پەیامـەکانی نـووری دەوتـەوە و یـەك شـەممانیش وانـەی

گەشەپێدانی مرۆیی و چۆنێتی سەرکەوتنی بە کچانی لاو دەگوتەوە. خزمەتی ئیمانی مەدینە زوو فراوان بوو و، سەدان کەسی تینوو بە ڕاستییەکانی ئیمان و قورئان لەدەوری گردبوونەوە. مەدینەش بۆ ئەوەی بزانێت ماندووبوون چییە، تادەهات هەوڵی زیاتری دەدا.

حاڵی ئەو هاونیشتیمانیانەی کە لە دەرەوەی وڵات لەدایك بووبوون و گەورەبوون، بەڕاستی شایانی ئەوەبوو مرۆڤ دڵی بۆیان بسووتێت. گەورەترین حەسرەتی دایکان و باوکانی ئەوێ ئەوەبوو کە ڕۆڵەکانیان ژیانێك دەژین دوور لە دین و زمان و وڵات و کلتووری خۆیان. شتێك نەبوو بەناوی ئارامی و ئاسوودەیی لەنێو خێزاندا، چونکە منداڵەکان وەکو بیانییەکان پەروەردە دەبوون و بە تێپەڕبوونی کات دوور دەکەوتنەوە. لەبەر ئەمە خزمەتی ئیمانی مەدینە بووبوو بە مایەی هیوا بۆ چەندین دایك و باوك. لە ماوەیەکی کورتی وەکو چەند مانگێکدا نزیکەی سەدان کچ لە دەوری مەدینەکەم خڕبووبوونەوە و جیهانێکی تازەی ئیمانی و مەعنەوییان دۆزیبووەوە.

## وتەی گاورێك

دوو ئافرەتی گاور کە پیشەیان مامۆستایەتی بوو، پەرۆش بوون بزانن چۆن کچانی موسوڵمان دەتوانن ژیانێکی ڕێکوپێك و سەقامگیر بژین. مەدینەیان ناسیبوو و دۆستایەتییان لەگەڵ بەستبوو. زۆری نەبرد مژدەی موسوڵمانبوونی ئەم دوو خانمە هەموومانی دڵخۆش کرد. یەکێکیان وتەیەکی وت کە هەرگیز بیرم ناچێتەوە:

ـ مەدینەخان، ئێوە دەزانن قورئانی پیرۆز و تەفسیرەکەی کە لەبەر دەستتاندان، چەند گرنگ و کاریگەرن؟ مادەم ئەم پەڕاوانە ئەوەندە بەسوودن، بۆچی بە دنیای ڕاناگەیەنن و بیر لە ڕزگارکردنی ملیۆنان گەنج ناکەنەوە کە ژیانیان لە باری دەروونی شێواودا دەگوزەرێنن؟ بۆچی حکومەتەکانی ئێوە بیر لە وەها کارێك ناکەنەوە؟ ئەگەر ئەو کتێبانە لە دەستی حکومەتی ئێمەدابووایە وەریاندەگێڕایە سەر هەموو زمانەکانی دنیا و لە قوتابخانەکاندا بە وانە دەیانوتەوە. کەچی ئێوە بە پەنجا شەست کچەوە خۆتان خەریك کردووە. نەك تەنها مشتێك مرۆڤ، بەڵکو هەموو مرۆڤایەتی پێویستی بەم ڕاستییانە هەیە... ئەگەر ئێوە نەیانگەیەنن بە هەموو کەسێك، چۆن وەڵامی خوا دەدەنەوە؟

## میوانیەکی مەعنەوی

ڕۆژێکی یەك شەممەبوو. مەدینە لەگەڵ کچاندا وانەی چۆنێتی سەرکەوتن و پەرەپێدانی مرۆیی هەبوو. من لە ژوورەکەی تەنیشتەوە گوێم لە وتەکانی بوو و سوودی زۆرم لێ وەرگرت. وانەکە بە شێوەی گفتوگۆ و پرسیار و وەڵام بوو. ئەم کچانەی کە دوور لە نیشتمان پەروەردە بووبوون هێندە گرنگییان بەم کەش و هەوا مەعنەوییە دەدا، بەدڵ و بە گیان گوێیان دەگرت. یەکێك لە کچەکان ئەم پرسیارەی کرد:

ـ مەدینەخان، تۆ هەمیشە باسی گرنگی کتێب خوێندنەوە دەکەیت، بەڵام من بە دڵ حەزی لێناکەم. ئەو کتێبەش کە بە زۆر دەستی پێدەکەم

ناتوانم تەواوی بکەم. دەبێت چی بکرێت بۆ خوێندنەوەیەکی ڕێکوپێک و بەردەوام؟

ئەم پرسیارە تەنها گرفتی ئەو کچە نەبوو. لەم سەردەمەدا کە کلتووری مۆدێرن باڵادەستە، بەداخەوە گەورەترین کێشەی زۆربەی گەنجان ئەمەیە. چونکە کەمترین شتێك کە بیکەین کتێب خوێندنەوەیە .

مەدینە دەستی کرد بە وەڵامدانەوەی پرسیارەکە:

ـ توبا گیان، تەنها تۆ نیت کە ئەم کێشەیەت هەیە. ئەمڕۆ کەسانێکی زۆر سکاڵا لە دەست ئەمە دەکەن. هەندێکیش دەڵێن لەگەڵ ئەوەشدا کە دەیانەوێت دەست پێبکەن، بەڵام هەرچەند دەکەن سەرکەوتوو نابن، یان ناتوانن ئەوە تەواوبکەن کە دەستیان داوەتێ. واتە خووی خوێندنەوەی بەردەوام لەلایان دروست نابێت.

کاتێك یەکێك دەیەوێت بخوێنێتەوە و ناتوانێت، ئەمە لە سنووردارێی بەهرە و تواناکانییەوە نییە، بەڵکو لە نەزانینی چۆنێتی بەکارهێنانیانەوەیە. ئەمە لە کاتێکدا کە خوێندنەوە خۆراکی گیانە. چەند زیاتر و ڕێکوپێکتر کتێب بخوێنرێتەوە، مرۆڤ ئەوەندە هەلی ناسین و دۆزینەوەی خۆی دەبێت.

پەرەپێدانی خوێندنەوە وەك هەر بەهرەیەکی تر پێویستی بە ئارامگری و بەردەوامی هەیە. خوێنەر بە لەبەرچاوگرتنی چەند بنەمایەك و هەوڵی چڕوپڕ، دەتوانێت ئەم توانایەی بەرەوپێش ببات بێ ئەوەی پێویستی بە کەسانی تربێت.

خوێندنـەوەی شـپرزەو هەڕەمـەکی ئـەو تینوێتییـەمان بـە زانسـت ناشکێنێت، بۆیـە هـەروەك هـەموو بوارەکـانی تـری ژیـان بـۆ خوێندنـەوەو تێگەیشـتن پێویسـتمان بـە پـلان و پرۆگـرام دەبێـت. بـۆ بـەخووکردنی خوێندنـەوەو وەرگرتنـی باشـترین زانیـاری لـەو بابەتـەی دەیخوێنینـەوە دەبێت کۆمەڵێ یاساو پرەنسیب لەبەرچاو بگیرێن و جێبەجێ بکرێن.

بۆئەوەی خوێندنەوە ببێتە بەشێك لـە ئاکارمـان و لەسـەری بـەردەوام بین پێویسـتە هەنـدێ خـاڵ ڕەچـاو بکرێـت. ئێـوە بـەمجۆرە لـە بابەتەکـە بڕوانن:

ئادەی بەراوردێك بکەن لەنێوان ڕۆڵە کەسیی و کۆمەڵایەتییەکانی ئـەو کەسانەی لەم سەردەمەدا کەم دەخوێننـەوەو ئەوانـەی زۆر دەخوێننـەوە. بـیر لەوشتە پـۆزەتیڤ و باشـانە بکەنـەوە کـە خوێندنـەوە وەك ئیمتیـاز بەئێوەی دەبەخشێت. فەرامۆشی مەکەن کە کتێب خوێندنـەوە زۆر کێشـە چارەسـەر دەکـات، ئاسـودەیی سـایکۆلۆجی و دەروونیمـان بـۆ دێنێـت، دەبێتــە نـزیکترین و ڕاسـتگۆترین هـاوڕێ و دۆسـت، ناهێڵێـت چـرکەو خولەکانی تەمەنمان بەهەدەر بڕوات.

لە پەرتووکێکەوە دەست بە موتاڵا بکـەن کـە بابـەت و ناوەڕۆکەکـەی سـەرنجتان ڕادەکێشـێت، بـا حـەزو ئـارەزووی خوێندنـەوەتان زینـدوو ببێتەوە.

کتێب خوێندنەوە ببەستنەوە بە پـلان و بەرنامەیەکـەوە. بـۆ نموونـە ڕۆژانە ئەوەندە پەڕە لە فلانە کاتژمێردا، یاخود لە کۆتـایی هەفتـەدا، بـەو

جۆرەو... هتد. جگە لەوەش بۆ خۆتان لە پلانەکەدا ئامانجێکی وەك "لەهەفتەیەکدا یاخود لە مانگێکدا ئەوەندە کتێب دەخوێنمەوە" بۆ خۆتان دیاری بکەن.

هەموو تاکێکی کۆمەڵگاو بەتایبەتیش خوێندکار پێویستە نەریتی کتێبخوێندنەوە لەخۆیدا جێگیر بکات. چونکە لەم سەردەمەدا کە زانست و تەکنەلۆجیا زۆر بەخێرایی گەشە دەکات و پەرە دەسێنێت، مەحاڵە ڕێگایەکی تر هەبێت بۆ سەرکەوتن.

## پرسیارەکان زۆر جوانتر بوون

کچێك بەناوی یاسەمین پرسیارێکی زۆر جوانتری کرد.

– دادە مەدینە، کێشەی من جیاوازترە. من زوو تووڕە دەبم. دایکم و باوکم و هاوڕێکانم زوو دەڕەنجێنم. کاردانەوەکانم ڕەق و پەلەن. لەپاشانیش ناڕەحەت دەبم بەو کارەم. بۆ ئەمە دەبێت چی بکەم؟!

– یاسەمین، هەموومان دەزانین تووڕەیی هەڵسوکەوتێکە کە مایەی "ناڕەحەتی دەروونی"یە بۆ خاوەنەکەی و ئەو کەسانەشی کە لە پەیوەندی دان لەگەڵی.

کەسی ئاسایی، لە کات و شوێنی خۆیدا توڕە دەبێت. بێگومان ئەمە حاڵەتێکی ئاسایی و سروشتی دەبێت. لەگەڵ ئەوەشدا هەندێك مرۆڤ کە توڕە دەبن بەسەر خۆیاندا زاڵ نابن و دەست ناپارێزن. بەمەیش کۆنترۆڵی خۆیان لە دەست دەدەن. ئەو کەسانەی کە لە منداڵییاندا نەژیاون و لەژێر فشاری ویستی دایك و باوك لەخێزانەکەیانداو مامۆستاو کۆمەڵگەشدا

گەورەبوون، لە داهاتوودا هەڵەشەو کێشاوی دەردەچن. لەبەرامبەر کەسانی تردا کەم بەرگەدەگرن و هەڵسوکەوتی نەشیاو دەنوێنن. ئەو کەسانەیش کە لەژێر فەرمانی پەستێنەری کەسانی گەورەتردا ئاڕاستە دەکرێن، دەبنە مایەی ناڕەحەتیو بێزاری بۆ ئەوانی تریش.

هەندێك جار ئەو کلتورەی پێوەی وابەستەین، زۆرمان لێدەکات بۆ ڕق دەربڕین و تورەبوون. لە هەندێك کاتدا ناچاردەبین باوەڕمان بە تورەبوون هەبێت، بێگومان بە تێپەڕبوونی کات ئەم هەڵسوکەوتە ڕقاویانە لەدەروونماندا درزی گەورە دروست دەکەن، ئیتر خەریك دەبین بەوەی لەخۆمان دووربکەوینەوە. لەدوای ئەمەوە لە خۆمان دڵنیانابین، ناچار بە ژیانێکی گۆشەگیرو خۆپارێز یاخود پێچەوانەکەی پەلاماردەر و هەڵەشە دەبین.

لەوانەیە زۆر تووڕەبوون هێمایەك بێت بۆ دەستپێکی کێشەو بەڵای تر لەژیانماندا و بەردەوامی بدات بە هەڵسوکەوتی ڕقاویی ڕابردووەوە و زیاتر فێری تورەبوونمان بکات.

هەموومان ئەوە دەزانین کە ڕق لێ بوونەوە هیچ کات لە وەستان و باری ئاساییدا نایەت. هەرچۆن بێت دەبێت هۆکارێك هەبێت، کە ئەو تورەییە دروستبکات.

پێویستە ئەوە لەبیرنەکەین تووڕەبوون هەستێکە وەکو هەموو هەستەکانی تر دەتوانرێت لەژێر کۆنترۆڵدا بێت. وتەیەکی جوان هەیە کە

دەڵێت: "ئەو کەسەی بتوانێت بەر بە تووڕەیی یەک خولەکیی لەژێر فشاردا بگرێت، دەتوانێت پێش بە نارەحەتی یەک ڕۆژی بگرێت".

تەنانەت تووڕەبوونی ساتێکی کەم، ڕەنگە ببێتە هۆکاری تەمەنێك لە ئازارکێشان.

میکانیزمی پەرەسەندنی تووڕەبوون بەم جۆرەیە:

لەژێر مێشکەوە گورزەیەك لە خانەی تووڕەیی هەیە بە ناوی (هایپۆثەلەمەس). هایپۆثەلەمەس مەرکەزی ئاڕاستەکردنی هەستەکانمانە. ئەرکەکەشی ناردنی هەستەکانە بۆ بەشی پێشەوەی مێشك، بۆ گەڕانەوەی کاردانەوە لەلایەن مێشکەوە. هایپۆثەلەمەس مەرکەزی هەستەکان و مێشکیش مەرکەزی بڕیاردانە.

ئەگەر هاتوو کەسێك سووکایەتی پێ کردین و ئێمەیش تووڕە بووین ئەوا سەرەتا ئاگاداری بە هایپۆثەلەمەس دەگات. ئەگەر لەکاتی تووڕەییەکەدا لەو شوێنەو لەوبارەدا بمێنینەوە، ڕەنگە سەرەنجامەکەی خراپ بێت و تووڕەییەکەمان توندتر ببێت. ئەگەر ئەوەی دەمانەوێت لەو چرکەیەدا بیکەین و بیڵێین بۆ چەند چرکەیەك دوای بخەین، ئەوا بەتەواوی پەیامەکە لە هایپۆثەلەمەسەوە بە مەرکەزی مێشك دەگات. ئەگەر ئەو سوکایەتییەی ڕووبەڕوومان بوەتەوە لە مەرکەزی مێشکدا لێکی بدەینەوە، ئەوا بڕیاری دروستی لەسەر دەدرێت و کێشەکە چارەسەر دەبێت.

کەواتە کەسانی تووڕە هەوڵ دەدەن کێشەکان لەمێشکیاندا نا، بەڵکو لە هایپۆثەلەمەسدا چارەسەر بکەن.

بەرلەوەی کاردانەوەی ڕەق بەرامبەر کەسێك بنوێنین، ئەگەر سورەتی (الإخلاص) سێجار بخوێنین، یاخود بۆ ماوەیەك تا ژمارە بیست بـژمێرین، ئەوا توڕەییەکە کەم دەبێتەوەو توندی کاردانەوەکەشمان دادەمرکێتەوە.

ئـەو کەسـانەی لـەم کاتانـەدا دەتـوانن بەسـەر خۆیانـدا زاڵ بـن، لـە کەشتیەوانێك دەچن لەناو دەریایەکی شەپۆلاوی و پڕگەردەلوولدا . دەبێت لەبیریشمان نەچێت کە کەشتیوانی باش بەسـەر شـەپۆلەکانی دەریـادا زاڵ دەبێت.

لەکاتی تووڕەبوونماندا پێویستە هەمیشە بیر لەوە بکەینـەوە، کەسـی بەرامبەر لەبەرچی ئەو سوکایەتیە یاخود ئەو هەڵسـوکەوتە ڕەقـەی نوانـد. گومانی تێدا نییە کە دەرمانی تـووڕەیی، ئارامگرییـە. پێویسـتە بـیر لـەوە بکەینەوە کە ئارامگرتن بەر بە تووڕەیی دەگرێت، توڕەبوون جگە لە زیـان هیچ سوودێك ناگەیەنێت و، لەوانەیە ئەو توڕەبوونە لەجێی حەقێك بڕیار بە ناحەقییـەك بـدات. تەنانـەت لەوکاتـەی زۆرت بـۆ دەهێنرێـت و ناچـار بـە تووڕەبوون دەکرێیت، پێویستە باشترین ڕێگەی ئـارام بوونـەوە بگریـت بـە وتنی: "تۆ دەدەمە دەست خوای گەورە".

### ئەم گفتوگۆیە، بۆ من بوو

خانمێکی تر بەناوی موزەییەن، دیسان کەوتە باسی کێشەیەك کـە لـە دەردی ئێمە دەدوا:

- دادە، کێشەی من بیرئاڵۆزییمە. شت زوو لەبیردەکـەم. عـەقڵی خـۆم بـۆ کۆناکرێتـەوە، مێشـکم پەرتەوازەیـە. لەبەرئـەوە جارجـارە لەگـەڵ دایکـم

بۆڵەمان دەبێت. چارەسەری ئەمە چییە؟! ئەگەر یارمەتی من بدەیت، ژیانم دەگۆڕێت. منیش دوعاتان بۆ دەکەم.

مەدینە لە وەڵامی ئەمەدا بە شۆخییەك دەستی بە قسەکردن کرد: "واتە ئەگەر یارمەتیت نەدەم، دوعام بۆ ناکەیت!"

لەدوای زەردەخەنەیەکی نەرم، هاتەسەر باسەکە:

- مێشك بەنرخترین هۆکاری بوونی مرۆڤە. هەموو زانیاری و واتاکانی مرۆڤ لەوێدا کۆدەکرێتەوەو دەپارێزرێت.

مێشك و بیر لە تەواوترین ئەو دیارییانەیە کە خوای گەورە بە مرۆڤی بەخشیووە. ئەمە دیارییەکی وایە کە "ئەگەر نەبێت، ئیتر ئەو مرۆڤە هیچی نییە".

گرنگی ئەم دیارییەش لەکاتی دەرکەوتنی کێشەکانی فەرامۆشی و کەمزەینیدا، باشتر هەست پێدەکەین.

چەند هۆکارێکی فیزیکی و دەروونی هەیە بۆ کەمزەینیو فەرامۆشی.

پێویست ناکات باس لەوە بکەین مێشك و بیر بۆ مرۆڤ چ مانایەکیان هەیە. بەڵکو کێشەی بنەڕەتی مەسەلەی : "چۆن مێشك بەهێز دەکرێت و چۆن پێش بە لەبیرچوونەوە بگیرێت؟"ە.

بۆ ئەوەی لە چارەسەری ئەم کێشەیەدا یارمەتیت بدەم، چەند پێشنیارێکت دەخەمە بەردەست. دەمەوێت بە وردی و هەستیارییەوە پەیڕەویی بکەیت:

سەرنجی ڕێکوپێکی ژیانت بدەو بە بەرنامە بژی.

خووی کارکردنی بە پلان و بەرنامەدارێژراوت پشتگوێ مەخە.

بۆ تێگەیشتن لە باسێك، تیایدا چڕبەرەوە.

بەشێوەیەکی ڕێکخراو دووبارەی بکەرەوە.

هەموو سەرنجەکانت لەسەر ئەو باسە کۆبکەرەوە کە تیایدایت.

باسێك لەگەڵ باسێکی تر تێکەڵ مەکە.

ئەو باسەی دەتەوێت بیرت بێتەوە، بە تێبینی بینووسەو جیای کەرەوە.

بۆئەوەی ناوت لەبیر نەچێتەوە، لە دەروونی خۆتدا دووبارەی بکەرەوە، یاخود بە هۆی لێکچواندن بەشتێکی تر بیرخۆتی بهێنەرەوە.

ئەو کەلوپەلەی بۆ کارێکت پێویستە، لە شوێنێك دایبنێ کە چاوت لەسەری بێت.

مەوعیدو پەیوەندیەکانت و، ئەوکارەی پێویستە ئەنجامی بدەیت، یاخود ئەو چالاکیەی دەتەوێت بەشداری تێدا بکەیت، لە دەفتەری کاری ڕۆژانەتدا تۆماری بکە. هەموو بەیانیەك چاویان پێدابخشێنەرەوە بەتایبەتی ئەوەی بە پێویستیی دەزانیت.

فەرامۆشی یاخود لەبیرکردن، بە کۆکردنەوەی زەین و کۆنترۆڵ کردنی بەردەوامی لەلایەن مرۆڤ خۆیەوە و بە زانینی ئەوەی بۆچی دەژی و بە پەیڕەوکردنی ژیانێکی بە پلان، بەتەواوی کەم دەبێتەوە.

پێویسـتە ئـەوەشمان لەبیرنەچـێت کـە، هەنـدێك شـت لـەبیرکردنی بەهێندەی لەبیرنەکردنی گرنگە. ئەگەر مـرۆڤ هـیچ شـتێکی لەبیرنەکردایـە، ئەوا هەمیشە ڕووداوە بە ئازارەکانی ڕابردووی، ژیانی لێ دەکردە ژەهر.

کەواتە، وەك چۆن زەین لوتف و میهری خوای گەورەیە، بەو جۆرەش لەبیرکردن لوتفێکی تـری ئـەو زاتەیـە بەسـەرمانەوە. ئـەم هاوسـەنگییەش لێرەدا بۆ پێشگیری کردنە لە لەبیرکردن یاخود تێکەڵاوکردنی شتەکان.

وەکو دەرمان دەهات..

مەلـەکی خوشـکمان کـە لـە دووری چـوار سـەعات ڕێگـەوە هـەموو هەفتەیەك بۆ بەشداری کردن لـە وانـەکانی مەدینـەدا، دەهـات، هـەمووکات پرسیارێکی ناو دەروونی منی ئامادەکردبوو:

– مـن زۆر خۆسـەپێنەرو بەپەلـەم. لەبەرئـەوە زۆرجـار شکسـت دەخـۆم . هەندێك کات فشار لە هەموو شتێکدا دەکـەم. ئەمـەش لەژیانـدا وا دەکـات ئیتر بەرگە نەگریت. پێشنیاری ئێوە چییە بۆم دادە مەدینە؟!

– ئای مەلەکی خوشکم. تەنانەت ئێستاش کـە پرسـیارەکەت کـرد، پەلـەو شـڵەژانت پێـوە دەرکـەوت، بـەڵام بـا یەکسـەر پێـت بڵـێم: شـڵەژان لـە قسەکردندا ئەوەندەیش ڕەفتارێکی ترسێنەرو زۆر خراپ نییە، بەڵام ئەگەر کۆنترۆڵ نەکرێت ڕەنگە کێشەی لێ بکەوێتەوە.

ناڕەحەتی و بەڵاو ڕووداوی لەناکاو هۆکاری فشارو شڵەژانن. هـەروەها ئەو هەڵەو ئازاری ویژدان و ناڕەحەتییانەی مرۆڤ لە ڕابردوودا چەشتیویەتی

بە هەمان شێوە دەبێتەهۆی دروست بوونی بێ متمانەیی و خەم خواردن بۆ داهاتوو، کە ئەمەش تەنگژەی دەروونی و فشار دروست دەکات.

لە گرنگترین هۆکارەکانی فشارو تەنگژەی دەروونی لەمڕۆماندا، گۆڕانکارییە لە فەلسەفەی ژیانی مرۆڤەکاندا و بەجێی گرنگیدانیان بە بەها مەعنەویەکان، گرنگی بە ماددیی بوون و ژیانی وجودیانە دەدەن. کەسانی پێش ئێمە پێکەوە ڕاوێژیان دەکرد، بە یارمەتی دانەوە دەژیان و قەناعەتیان بە بەشی خۆیان هەبوو، لەم سەردەمەدا تەنها پێوەر بۆ بەنرخیی مرۆڤ "دەوڵەمەندی"یە. ئەم کەسانەیش بۆ بەرزبوونەوەو بەدەست هێنانی زیاتر هەموو شتێك بۆ خۆیان بە "ڕێگەپێدراو" دەبینن، بێگومان لەکاتی تەنگ و چەڵەمەدا کەسێك نابینینەوە بۆ دەردە دڵکردن لەلایان.

بێگومان لەم بارودۆخ و حاڵانەدا فشار و گرێ دەروونیەکان زیاد دەکەن.

فشارێك ئەگەر لە پلەیەکی ئاساییدا بێت مرۆڤ دەپارێزرێت، لە ژیانی ئاساییدا، بوونی فشارێکی ئاسایی و گونجاو، مرۆڤ چالاك دەکات، دەیگرێتەوەو لەسەر پێی خۆی ڕایدەگرێت، بەڵام ئەمە دەبێت بە ڕێژەیەکی وەك پێویست بێت.

سەرەتا پێویستە ئەو کەسە خۆی بناسێت، لەخۆی تێبگات، بە مانایەکی تر خۆی بدۆزێتەوە. لە پاشان پێویست دەکات کە ڕووداوەکانی

دەوربەری بە دروستی هەڵسەنگێنێت و لە گۆشەنیگایەکی فراوانەوە بڕوانێت و شتەکان جوان ببینێت.

مرۆڤ پێویستە لەگەڵ خۆی و خێزانەکەی و کۆمەڵگەو دنیاشدا بە ئاشتەوایی بژی. ئەو کەسەی بە دوژمنایەتی لەگەڵ خۆی و دەروروبەریدا بژی، دۆستێکی دەستگیرنابێت. بە تەنها دوژمنایەتی ناو ناخی و ئەوانەی دەوروبەریشی گەورەتر دەکات.

مرۆڤ نابێت بەو کەللەڕەقییەو بیر وشکییەی لە مێشکی خۆیدا دروست دەبێت، بڕوانێتە ئەوانی تریش. پێویستە لە پەیوەندییەکانیدا و لە لێکدانەوەی ڕووداوەکاندا ئارام و هۆشیاربێت.

مرۆڤی بەفشارو شڵەژاو زۆرکات ئەم ڕاستەقینەیەی پێ پەسەند ناکرێت. ئەو لە ئەقڵی خۆیدا کێشەکان گەورەتر دەکات. لەناو بارقورسیەکاندا ئەوەندە گیردەخوات کە ئیتر ڕاستیی و خەیاڵەکانی بۆ لەیەك جیاناکرێتەوە. ڕەنگە کێشەکانی جددی و گەورەبن. لەوانەیە تووشی شکست لە هاوسەرگیری، بێکاری یاخود بێپارەیی و منداڵی نەخۆش ببێت.

بەڵام تلانەوە بەم کێشانەوە نابێتە دەروازەی چارەسەر.

کتێب خوێندنەوە، هەوڵ دان بۆ نووسین، وەرزش کردن، پیاسەکردن لە هەوای خاوێندا، ڕاهێنانی ڕێکخراو و پشودان دەبنە هۆی کەمکردنەوە فشارە دەروونیەکان.

بیروباوەڕی مرۆڤ لەگەڵ کاریگەریی بەهێزی ڕەوشتبەرزی و پابەندی بە بەها مەعنەوییە بەرزەکانەوەش، هۆکاری گرنگی کەم کردنەوەی گرژیە دەروونیەکانن.

بە تایبەتی ڕێنماییەیە دینییەکان ڕۆڵی چەتری پارێزەر دەبینن.

بە تەنها مانەوەی مرۆڤێك کە باوەڕی بەوە بێت ئەم گەردوونە هەر لەخۆیەوە دروست بوەو لەناو تەوەرەی خۆیدا بخولێتەوە، لەگەڵ بارگرژی دەرووندا، زۆر زەحمەتە. مرۆڤی ڕاستەقینەی خاوەن مەنتق کە لە دەمارگیری بەدووربێت، ناچێتە ناو ململانێی سەختی کێشەکانەوە، بەڵکو بۆ حیکمەتەکانی پشت ڕووداوەکان دەڕوانێت. جوان دەبینێت و، جوان بیر دەکاتەوەو چێژ لە ژیانی وەردەگرێت .

لەهەموو شتێك سکاڵا ناکات. خەم و ناڕەحەتیەکانی ناو دنیا هەموو نادات بەکۆڵیدا .

کێشەی گرنگی مرۆڤی ئەم سەردەمە بۆ ڕزگار بوون لە فشارو گرژی دەروونی لەو بارودۆخەدایە کە تێیدان. ئەوە قورسە کە مرۆڤ بەبێ ناسینی خۆی و زانینی کێشەکانی و هۆکارەکانی، بیەوێت خۆی بەڕێوەبەرێت و، لە فشارەکانیش دەربازی ببێت.

وەڵامەکان زۆر جوان بوون. چ جوانیەك! تێگەیشتنەکانمانی تێردەکرد وەکو میواندارییەکی شاهانە. دیارە مەدینە کە ئەم وەڵامانەی دەدایەوە، سەرەتا بیری لە پێویستیی من دەکردەوە بۆ ئەو قسانە.

بە ڕاددەیەك لەناو ئەو گفتوگۆ سەرسوڕهێنانەدا خۆم ون کردبوو کە لە بەرامبەر ئەو هەموو هەست و پەرۆشیانەمدا ئەو شەوە هیچ خەو نەچووە چاوم. تا بەیانی سوپاس و شوکری خودام کرد. کە میهرەبانترین و بەسۆزترین کچی ڕۆژهەلات "مەدینە"ی بۆ یارمەتی من نارد.

ئەوە سوپاس کردنێك بوو کە بە پارچە پارچەبوونی دڵمەوە، بە سوتانی هەستەکانمەوە، بە لەرزینی ناخمەوە لەبارەگای خوای تەعالا پاڕامەوە. لەکاتێکدا زمانم گوێی نەدەکرد، چاوە وشك و برژانگە ئالۆزاوەکانم فریام کەوتن و بێدەنگ و بە ئارامی فرمێسکیان ڕژاندە خوار.

مەدینە کاتێك بۆ نوێژی بەیانی هەستا، منی لەو حاڵە هەستیارەمدا، -کە بەچەپ و ڕاستمدا دەتلامەوە- بینی، لە بارودۆخم تێگەیشتبوو.

وەکو خۆری گزنگی بەیانی کە ناخی مرۆڤ گەرم دەکاتەوە بە نیگا پڕ ماناکانی هاتەلام. بەو دەستانەی کە بەر هەر جێیەك بکەوێت شیفا بەخشە، فرمێسکی چاوەکانمی سڕی.

وتی: " دەزانیت کە هەرگیز بەرگەی ئەم گریانەت ناگرم، بەڵام ئیتر کاتی گریانە، چونکە ژەنگی دڵ بە شتێکی تر جگەلەمە پاك نابێتەوە و، ناشۆڕێتەوە".

ئەو مامۆستایەك بوو، منیش یەکێك لە قوتابیەکانی ئەو. ئەو پزیشکێك بوو منیش یەکێك لە نەخۆشەکانی.. ئەو دایکێك بوو منیش یەکێك لە ڕۆڵەکانی..

له بەرامبەر ئەم هەموو جوانییەدا، ئەگەر شوکرو سوپاس نەکرێت، ئەی چی بکرێت.؟!

## مەدینە کە قسەی دەکرد تیایدا دەژیا

یەکێکی تر لەو گفتوگۆ جوانانەی کە لە مەدینەوە بیستم، کۆتایی هەفتەیەك بوو. وەك هەموو کات دیسان میواندارییەکی پڕ لە گفتوگۆی شیرین، کە دڵی هەموو ئامادەبوانی حەیران دەکرد، سازکرد.

چی لەو گفتوگۆیەدا نەدەپرسرا؟! لەگەڵ تێپەڕبوونی کات من زیاتر سەرسامی ئەو پرسیارو وەڵامانە دەبووم و زیاتر خۆم دەخستە ناو ناخی وتەکانەوە.. چۆن ئەوانە لەبیردەکەم!

زەهرا، کچی مامۆستا یەحیا کە لە مزگەوتی ئەو شوێنەی ئێمە لێی نیشتەجێ بووین ئیمامەتی دەکرد، ئەو ڕۆژە پرسیارێکی زۆرجوانی بۆخۆی هەڵبژاردبوو.. ئەو پرسیارەی کە ئەو بەیانی کرد، زۆرێك لە گەنجەکانی خستە ناو گفتوگۆکەوەو باسێکی قسە هەڵگربوو.

– مامۆستا مەدینە، ئەم پرسیارەی من دەیکەم، لەلایەن هاوڕێکانم، خەدیجە، مەقبوولە، ئیسرانوور، شەیماوە پێکەوە ئامادەمان کردووە. ئێمە دەمانەوێت سەرکەوتوو بین ، بەڵام بەجۆرێك سەرکەوتن بەدەست ناهێنین. هەردەم لە هاوەڵەکانمان دوادەکەوین، ئەم بارودۆخە خۆمان و خێزانەکانیشمان ناڕەحەت دەکات. بۆ سەرکەوتن، چ ڕێگایەك بگرینەبەر؟

مەدینەیش، دەستپێکێکی زۆر پڕمانای کرد:

– هاوڕێیان، ماوەیەك من هیچ كەس نەمابوو كە ئەم پرسیارەم لێ نەكردبێت. دەمویست سەركەوتوو بم بەڵام بەجۆرێك نەدەگەیشتمە ئەو پلەیەی كە دەمویست.

لەگەڵ ئێوەدا ، ئەوانەی خۆم تاقیمكردوەتەوە بە پراكتیكی بۆتانی باس دەكەم، بەڵام باش گوێ بگرن. چونكە بۆ بەدەست هێنانی ئەو ئەنجامانە زۆر شكستخواردنم بەسەرهاتووە.

لەباسی "سەركەوتن"دا ، ئەم وتەیە بكەنە گوارە لەگوێكانتاندا.

"سەركەوتن، بە باوەڕهێنان بە سەركەوتن دەست پێ دەكات"!

وتنی: "سەردەكەوم" مانای یەكەمین هەنگاوە لە ڕێگەی سەركەوتندا..

لە سەركەوتندا، خواست، بڕیاردان و ئارامگرتن زۆر گرنگە. بە خواستەوە دەست بە هەر هەوڵێكتان بكەن، لەسەر بڕیارەكانتان بەردەوام بن و بە ئارامگرییەوە تەواوی بكەن، ئەگەر نا لەنیوەی ڕێگاكەدا جێی دەهێڵن.

لە سەركەوتن دا كاری بە پلان گرنگترین بنەمایە. بە پلان و بەرنامە كار بكەن، بە دڵنیاییەوە سەركەوتوو دەبن.

بۆ سەركەوتن و بوون بە كەسێكی گەورە، هەوڵی دەوێت. پیاوە سەركەوتووە گەورەكان، لەوانەن كە خۆیان ویستویانە ببنە كەسی گەورەی سەركەوتوو.

تـاوەكو شكسـت نـەبینرێت، سـەركەوتن بـەدی نایـەت. شكسـت دەستپێكی سەركەوتنە. بێكـەموكوڕی نابـێ، بـەڵكو سـەركەوتنی كۆتـایی بكەنە ئامانج. بێكـەم و كـورتی لەگـەڵ كەموكورتییـەكان و سـەركەوتنیش لەگەڵ شكستدا دەست پێ دەكەن.

لە كەسانی سەركەوتوو نموونە وەربگرن. هەوڵ مەدەن وەك ئەوان بن بەڵكو وەكو خۆتان بن .

گرووپی هاوڕێیانی باش كە ئێوە بەرەو سەركەوتن دەبـات، هەڵبـژێرن، لەو هاوەڵانەی كە دەبنە هۆی پەكخستنی هەوڵەكانتان دووربكەونەوە.

كاری ئەمڕۆ هـەرگیز بـۆ بـەیانی جێمـەهێڵن. چـونكە بـەیانیش كـاری پێویستی تایبەت بەخۆی دەبێت.

ئامانجێك بەگوێرەی توانای خۆتـان دیاری بكـەن. كارەكانیشـتان بـە گـوێرەی ئـەو ئامانجـە پلانرێـژی بـۆ بكـەن. هـەرگیز بـێپلان مـەژین. ئـەو كارەی دەستتان پێكرد، هەرچۆنێك بووە تـەواوی بكـەن. هـەموو كـارێكی تەواو نەكراو ، نموونەیەكی خراپ دەبێت بۆ هەر كـارێكی نـوێ كـە لـەدوای ئەو دێت.

هەوڵ دەن لە بابەتێكدا پسپۆڕی دەست بخـەن و تـەنها لـەو بـوارەدا چڕببنەوە. ئەوەتان بیر نەچێت، ئەو كەسەی بییەوێت هەموو شتێك بكات، هیچ شتێك ناكات.

كێشەكانتان و ئـەو كارانـەی بـۆ سـەركەوتنتان پێویسـتن بـەش بـەش بكەن. لە پچووكترینیانەوەو لـە ئاسـانترینیانەوە، بـەرەو گـەورەترینیان و

سەختترینیان دەست پێ بکەن. هەر کات کارە بچووکەکان ئەنجام درا، ئیرادەو خواست بۆ ئەنجامدانی کارە گەورە و سەختەکانیش زیاد دەکات.

کە لە هەوڵەکانتاندا تووشی ناڕەحەتی هاتن، خۆتان مەدەن بە دەستەوە. لەبیرتان نەچێت، گەورەترین سەرکەوتن ئەوەیە کە لە پاش ڕێگرییەکی زۆر بەدەست دەهێنرێت.

لە ژیاندا زانینی ڕێگەی سەرکەوتن ، بە هێندەی سەرکەوتن خۆی ، گرنگە. ئەو کەسەی ڕێگەی سەرکەوتن دەناسێت، یەکجار نا بەڵکو هەموو کات سەردەکەوێت. چونکە سەرکەوتن، بە ناسین و باوەڕپێهێنان بەدەست دێت.

ئەمانە بارستەیەك بوون لە پێشنیازی زۆر کەس. ئاشکرابوو کە لەژێر هەر دێڕێکیاندا، سەدان تاقیکردنەوە شاراوەتەوە. ئەوەش زۆر بەڕوونی دیاربوو کە سەرکەوتوویی مەدینە ، بە سوتفەو لەخۆوە نەبووە، بەڵکو ئەنجامی کارکردنی لە دڵەوەو ژیرانەی خۆی بووە.

## کۆتا وەڵام، وانەیەکی ژیان

کۆتا پرسیاری ئەو وانەیەش، مەدینە کردی:

- باوەڕتان بەوە هەیە کە پەیوەندییەکی ڕێکخراو و وەك پێویستتان لەگەڵ خێزان و دەوروبەرتاندا ، دروست کردبێت؟! بۆ ئەمە هیچ تەقەلایەکتان داوە؟

ئەو دەنگەی لەناو قەرەباڵغییەکەوە بەرزبووەوە، زۆر نەرێنی بوو. هەموو ئەوانەی ئەوێ کێشەیان هەبوو لە پەیوەندییەکانیاندا.

مەدینە وتی:

- کەوایە، کچەکان، ئەمانەی کە دەیانڵێم یان بیان نووسن یاخود باش گوێیان لێ بگرن. چونکە تەواوی ئەم قسانەی بۆتانی دەکەم، ئامۆژگاریی پراکتیکی و جێبەجێکراون. دەمەوێت ئەمانە بکەمە بەرنامەی ژیانتان.

خۆتان بۆ دۆستایەتی و هاوڕێیەتی و خزمەتکردن، ئامادەبکەن. بۆ ئەمەش کەموکوڕییەکانتان پڕبکەنەوە. هۆکاری دووره پەرێزییەکانتان بدۆزنەوە.

کەسایەتی زیانبەخش لەخۆتاندا ، لە ڕەگەوە هەڵکەنن. چونکە مرۆڤ نایەوێت ببێتە دۆستی کەسێك کە خاوەنی ڕەفتاری زیان گەیەنەر بێت. سەرنجی ڕواڵەت و جل و بەرگی خۆتان بدەن. لەکاتی قسەکردندا بێئەندازە ڕێزدەربڕن و کەسی بەرامبەرتان مەشکێنن.

ئەو کتێبانەی لەبارەی دۆستایەتی و هاوڕێیەتیو دروستکردنی پەیوەندییەوەن، بخوێننەوە. بەو شێوەیە زانیاری تیۆری باش لەبارەی دۆستایەتییەوە فێر دەبن.

لایەنێکی شیاو لە کەسی بەرامبەرتاندا بدۆزنەوە تاوەکو ستایشی بکەن و بە گرنگ نیشانی بدەن. هیچ مرۆڤێك ئەو گرنگییەی لە شوێنی خۆیدا پێی بدرێت، ناگەڕێنێتەوە. گرنگی پێدان یەکەمین هەنگاوی دۆستایەتییە.

تا ناچارنەبن، ڕەخنە لە دۆستەکانتان مەگرن. ئەگەر ناچاریش بوون ڕەخنە بگرن، سەرەتا ستایشی لایەنە باشەکانی بکەن، دواتر بەبێ ڕەنجاندن هەڵەکانی پێبڵێین.

وەکو سوکایەتی کردن هەڵمەکوتنە سەریان.

لەکاتە سەختەکانیاندا لەگەڵ هاوڕێکانتان بن، لە سات و شەوە تایبەتەکاندا پەیوەندییان لەگەڵ بگرن. چونکە بەوەفاترین و خۆشەویسترین دۆست، دۆستی هەموو ڕۆژێکی مرۆڤە.

دیاری بە هاوڕێکانتان بدەن. دیاری لە دڵەکاندا جێگەی خۆی دەگرێت. لەسەر ئەو پەیمانە بمێنن کە دەیدەن. ناتوانن بەهیچ شێوەیەکی تر متمانەپێکراویی خۆتان بسەلمێنن ئەگەر بەڵێنەکانتان نەبەنەسەر ، ئەوا ئەو کات متمانەی هاوڕێکانیشتان لەدەست دەدەن.

هەرگیز لە خۆڕا چاوەڕوانی دۆزینەوەی دۆستی بێکەم و کوڕی مەبن، چونکە سەرەتا ئێوە لەو کەسانە نین کە هیچ کەمو کورتییەکتان نەبێت.

ئەو وتەیە چەندە ڕاستە کە دەڵێت: " پێم بڵێ هاوڕێکەت کێیە، پێت دەڵێم تۆ کەسێکی چۆنی".

مانای وایە، دەبێت ئێوە ئاگاداری هەڵبژاردنی ئەو هاوڕێیە بن کە بەهۆیەوە داهاتووتان دیاری دەکات. لەبیرتان نەچێت ئەوەی هاوڕێیەتی بۆن فرۆش بکات، بۆنی گوڵ دەگرێت، ئەوەیش کە هاوڕێیەتی گۆشتفرۆش بکات، بۆنی چەوری...

پەرستشـــەکان ڕێکـــوپێکی بـــە مـــرۆڤ دەبەخشـــن. ڕێکـــوپێکیش بنچینەیترین وەسفی مرۆڤە لەکاتی دۆستایەتی کردندا.

لەدەوروبەرتانـــدا چـــاودێری هەڵســـوکەوتی کەســـانی ڕێـــزلێگیراوو خۆشویســتراوو دۆسـتی گیـانی بـە گیـانی، بکـەن ، پەیوەنـدییان لەگەڵدا دروسـت بکـەن. لێیانـەوە فێـر بـبن. بێگومـان لەوانـەش گـرنگتر ئەوەیـە، سەرەتا بیانکەنە دۆستی خۆتان .

ئەو کەسەی لەگەڵ خۆیدا ڕاستگۆبێت و متمانـەی بـەخۆی هـەبێت و لەهەڵسوکەوت و ڕەفتارەکانی خۆی ڕازی بێـت، هەمیشـە لەدەوروبەریشـی دۆستی باش دەدۆزێتەوە .

ئـەوەتان بیرنەچێت کـە ئـەو دایك و باوکـەی زۆرتـرین پەیوەنـدیتان لەگـەڵیان هەیـە، لـە باشـترین کەسـی بێگانـە بۆتـان باشـترن. بێگانـەکان دۆستی ڕۆژە خۆشەکانن، بەڵام ئەندامەکانی خێزان دۆستی هەموو ڕۆژێك و بەتایبـــەت ڕۆژە ســـەختەکانن. لەبەرئـــەوە هـــەموو کارەکانتـــان لەگـــەڵ خێزانەکانتاندا پلانڕێژی بکەن، پێشنیازو ڕێنماییـەکانیان لەبەرچـاوبگرن. چونکە ئەوان کەسانێکی بەئـەزموونن کـە بـەر لـە ئێـوە کەوتوونەتـە سـەر ڕێگەی ژیان .

پێویستە ئەوە لەبیر نەکرێت، ژیـان تاکـە کەسـیی نییـە. بـۆ ژیـانێکی بـەماناو بەختـــەوەری و ئاســـودەیی، دۆســـتی بـــە وەفـــاو متمانـــەپێکراو پێویستە، بەتایبەتیش دایك و باوك و خوشك و براکان... لەوجێیەی هەموو کەس بەجێتان دەهێڵێت ئەوان شوێنی خۆیان چۆڵ ناکەن.

ئەو ڕۆژە ... دیسان ڕۆژێکی جیاواز بوو. ڕێك وەکو هەر گفتوگۆیەکی جارەکانی تری کۆتایی هەفتە...

## سەرسامیم بۆ مەدینە تا دەهات زیاتر دەبوو

هەفتانە بە شەوقەوە گوێم بۆ وانەکانی مەدینە ڕادەگرت. نازانم ئایا من زیاتر سوودم دەبینی یان قوتابیەکانی؟ سەرباری ئەوەی کە پارچە گۆشتێکی مردووم مابووەوە، کەچی وتەکانی ئەو دڵی گوناهباری منی دەخستە جۆش و خرۆش. لە کاری پڕ نهێنی خوای گەورە بڕوانن کە هەموو ڕۆژێك سەرسامی و ڕێز و پەرۆشیم بۆ ئەو کچە پتر دەبوو کە ژیانم لەگەڵ پێکهێنابوو. هەموو ڕۆژێك وەك خوێندکارێك زیاتر سوودم لە زانیاری و ئیمان و خزمەتی ئەو وەردەگرت.

کچی خۆرهەڵات، واتە مەدینەی بچووك، چیتر بچووك نەبوو. فریشتەیەك بوو خۆشەویستی و ئاشتی و ئارامی بەچواردەوریدا بڵاودەکردەوە. بووبوو بە مەشخەڵێك بۆ خزمەتی ئیمان و قورئان. کەسانێکی زۆر حەزیان دەکرد پێی بگەن و چاوی لێبکەن و لەو خزمەتە جوانەدا یارمەتی بدەن، کەچی ئەو سەرباری هەموو مژوڵییەك بێ ماندووبوون و بێزاربوون خزمەتی منێکی بێگیانی بێخێری دەکرد. کەواتە گەورەیی مرۆڤە مەزنەکان لەوەدا دەردەکەوێت کاتێك ڕووبەڕووی بەربەستەکان و گرفتەکان دەبنەوە.

مەدینە سەرەڕای هەموو ئازار و نەهامەتی و لەمپەڕەکان، هەوڵ و کۆششێکی لەسنووربەدەری دەنواند و، بەمەدا دەریدەخست کە لە

سەختترین هەلومەرجدا هیچ کەسێك هۆیەکی نییە بۆ سەرنەکەوتن و هەوڵ نەدان.

ئەوانەی کە بیانوو دەهێننەوە بۆ تەمبەڵییان و، تاوان دەخەنە ئەستۆی خێزان و دەوروبەریان، گەرەکە لە مەدینە بڕوانن و بەخۆیاندا بچنەوە. خوای گەورە هەست و توانایی وای داوە بە بەندەکانی کە لە سەختترین بارودۆخدا بتوانن سەرکەوتن بەدەست بهێنن. دیارترین نموونە مەدینەبوو. ئەگەر کەسێك ناتوانێت سەرکەوتووبێت، بێگومان بەڕاستی بەدوای سەرکەوتندا وێڵ نییە، بەڵکو تەنها بەڕواڵەت داخوازیەتی. سەرکەوتن کاری دڵ و باوەڕە و پێویستی بە هەوڵی بەردەوام هەیە.

گەورەترین یاریدەدەری خزمەتە جوانەکانی مەدینەکەم ئایسون خان و کاك هاروونی خێزانی بوو. بە پێویستییەکانی ئێمە ئەوەندە باش شارەزابوون کە پێویستی بەوە نەدەکرد خۆمان دەری بڕین. بەتایبەتی نەیاندەهێشت مەدینە لە خوێندنەکەیدا هیچ کێشە و گرفتێکی بۆ بێتە پێش. مەدینەکەم هەرچیەکیان بۆ دەکردین مەسرەفەکەی لە دەفتەرێکدا بە تێبینی دەنووسی. هەڵیدەگرت بۆ ئەوەی لە داهاتوودا بیاندەینەوە. مەدینەخان و کاك ڕەسوڵیش کە لە وڵاتی یابان سەرگەرمی بڵاوکردنەوەی نووری ئیمان و قورئان بوون هەرگیز نەیاندەهێشت تەنیابین و هەردەم پەیوەندییان پێوە دەکردین. کۆمەکی و پاڵپشتی مەعنەوی ئەوان گەورەترین هۆکاری بەردەوام بوون و گەرمبوونەوەی ئێمەبوو.

مەدینە زوو زوو پەیوەندی بە خێزانەکەشیەوە دەکرد. کەم کەم لە زاری خۆی دەگرتەوە و فیداکارانە بۆی دەناردن.

ساڵان ئاوا تێدەپەڕین. کۆتایی خوێندنی مەدینەکەم نزیک بووبووەوە. پشت بەخوا دەبوو بە پسپۆڕ لەبواری ڕاگەیاندندا و کارەکەی دەکرد بە هۆیەك بۆ خزمەتکردنی خەڵك. باوەڕم وایە کە هەوڵ و هیوا و خزمەتی مەدینە لە گەڕەکێك یان لە شارێکدا جێی نەدەبووەوە و دنیای پڕدەکرد لە جوانی.

## خزمەتەکەی تا دەهات فراوانتر دەبوو

ڕووداوێك کە لەو ڕۆژانەدا ڕوویدا یەکەم مژدەی خۆشی لەم ڕووەوە دا.

" سەنتەری دیالۆگی نێوان ئایینەکان " کە لە لایەن چەند کەسێکی موسوڵمان و مەسیحی و زانایانەوە بەڕێوەدەبرا، سیمینارێکی فراوانی سازدابوو. لەنێو بابەتەکاندا باسی " پەروەردەی گەنج " جێیەکی گرنگی داگیرکردبوو.

مەدینە چەند مانگێك لەوەوپێش جۆش و خرۆشی ئەوەی لەو سیمینارەدا بەشداری دەکات ئارامی لێ هەڵگرتبوو. شەو و ڕۆژ خەریکی ئەو وتارەبوو کە ئامادەی کردبوو. بەڕاستی زۆر بە جوانی وتارێکی لەژێر ناونیشانی " کێشە هەنووکەییەکانی گەنجان و چارەسەری گونجاو و کرداری "، بە زمانی ئینگلیزی داڕشتبوو.

سەرەتا بەنێو هەموو ئایەتە پیرۆزەکانی قورئاندا گەڕا، پاشان نموونەی گونجاوی لە ژیانی پێغەمبەر ( دروودی خوای لەسەربێت ) و

هاوەڵانیدا کۆکردەوە. پاشان بۆچوونی ئەو زانا موسوڵمانانەی کۆکردەوە کە لە جیهاندا بە خزمەتکاری قورئان و ئیمان ناسراون، لەگەڵ چۆنیتی هەوڵدانیان بۆ چارەسەرکردنی ئەو گرفتانە. لە کۆتاییدا بەرهەمێکی ناوازە هاتەکایەوە.

پاشان گشت ئەم زانیاری و باسانەی لەنێو " زانستی ڕاگەیاندن " دا کە خۆی پسپۆڕبوو تێیدا، پێکەوە هەڵشێلا. بە کورتی و پوختی چەند پێشنیارێکی کرداری پێشکەش کرد بە ئامانجی چارەکردنی کێشەی لاوان.

ئەم هەوڵ و ماندووبوونە دوور و درێژە لە کاتی پێشکەشکردنی وتارەکەیدا لە کۆڕەکەدا، میوەی خۆی بەخشی. وتارێکی زۆر کاریگەر و بەپێزبوو. بەتایبەتی سەرنجی زانایانی بواری پەروەردە و مەسیحییەکانی زۆر ڕاکێشابوو. هەر لەوێدا لە لایەن چەندین کەس و ڕێکخراوەوە داوای کاریان پێشکەش کرد. واتە مەدینە کارا و لێهاتووەکەم کە وزە و بەهرەیەکی زۆری هەبوو، هەنووکە گەیشتبوو بەو شوێنەی کە شایانی بوو. بەڵام هەرگیز ئەم سەرکەوتنانە سەرمەستی نەکرد و بچووکترین نیشانەی خۆشویستنی " ناوبانگ " لە کردارەکانیدا نەبینرا.

ئەو هەر هێشتا کچێکی لادێیی خاکی بوو. هێشتا بەردەوامبوو لە خزمەتکردنی تۆپەڵە گۆشتی بێگیانی جەستەی من. چۆن لەبیرم دەچێتەوە میهرەبانی دایک ئاسای مەدینە و هەڵسووڕانی وەك پەروانە بەدەورمدا! ...

لەو ڕۆژانەدا دوو خێزانی مەسیحی کە سەرسام بوون بە کارە خێرخوازییەکانی مەدینە، بە خۆیان و منداڵەکانیانەوە هاتن بۆ ماڵمان. کاتێك ژیانی سادە و ساکاری خێزانی ئێمەیان بینی زۆر سەریان سووڕما. یەکێك لە پیاوەکان کە بەڕێوەبەری ڕێکخراوێکی مەدەنی بوو، داوای کاری پێشکەش بە مەدینە کرد و، وتی:

ـ ئێمە ڕێکخراوێکین لێکۆڵینەوە لەسەر کێشە کۆمەڵایەتییەکان دەکەین. حەزدەکەین لەگەڵمان کاربکەیت. زۆرمان پێویست بە شێوازی کار و جیهانبینی ئێوە هەیە. مانگانەیەکی زۆر و تایبەتیت پێدەدەین. جگەلەوەش ماڵێکت لەسەر داخوازی خۆت دەدەینێ و ژیانێکی کەشخەت بۆ دابین دەکەین. ئەم پیاوە کەمئەندامەی کە بووەتە بەربەست لە بەردەم زیاتر پێشکەوتنتدا، دەیبەین بۆ باشترین خانەی بێسەرپەرشتان و چاکترین خزمەتی دەکەین. بەم شێوەیە کاتێکی زۆرت دەبێت و دەتوانیت خۆت بۆ کارەکەت یەکلایی بکەیتەوە.

ئەم بابا مەسیحییەی کە پێی وابوو پێشنیاری جوان و دڵسۆزانە پێشکەش دەکات، مەدینە بە جۆرێك وەڵامی دایەوە کە هەرگیز لەبیرم ناچێتەوە و هەمیشە نەخشی لەسەر ڕۆحم دەمێنێتەوە:

– سوپاسی هەموو ئەم پێشنیارانەت دەکەم. بە سوپاسێکی زۆرەوە زۆرترین هەوڵی خۆم دەخەمە کار بۆ یارمەتیدانی کێشە کۆمەڵایەتییەکانی ڕێکخراوەکەتان، وەلێ ئەمە لەبەر پارەی زۆر یان بۆ بەدەستهێنانی ژیانێکی باشتر ناکەم. بەڵکو دەمەوێت جوانی ئیسلام و قورئان دەربخەم و

بیسەلمێنم کە چلۆن چارەسەرن بۆ گرفتە کۆمەڵایەتییەکان. جگەلەوەش مێردەکەم بار نییە بەسەرمەوە، بەڵکو سەرچاوەی ژیان و، وزەی جیهانی مەعنەوی منە. بێهێزی ئەو هێز بە من دەدات. کاتێك ئەو لەو حاڵەتەدا دەبینم بەزەیی و میهرەبانی ناخم دەگاتە لوتکە و تێدەگەم کە کێم و، چ کارەم و، حاڵی دەبم لەوەی مرۆڤ بوونەوەرێکی چەند لاواز و هەژارە.

تینوێتیم بە خۆشەویستی ئەو نەبێت ناشکێت. کەسیش زریانی بیرم هێورناکاتەوە ئەو نەبێت. واتە ئەو نیوەکەی تری تەمەنە یەکقاچیەکەی منە. لەو جیاببمەوە بە قاچێکەوە ناتوانم بەپێوە خۆم بگرم و دەگۆڕێم بە تەرمێکی بێگیان.

لە دڵی خۆمدا وتم: " ئاە، ئەی مەدینە دڵپاك و بێگەردەکەم! ئاە، مەدینەکەم! منێك کە ڕۆژێکی خۆشم پیشان نەداویت و تووشی دنیایەك چەرمەسەریم کردوویت، ئەم هەموو هەستە جوانە چییە کە لە بەرامبەرمەوە دەری دەبڕیت؟ من هەرگیز شایستەی ئەوە نیم، وەلێ تۆ شایانی گشت شتێکیت. بۆیە لە خوای گەورە دەپاڕێمەوە کە لەم سەرکەوتن بۆ ئەو سەرکەوتنت ببات و منیش بەردەوام بکات لە دواتەوە بە چاوی پڕ لە گریانەوە دوعات بۆ بکەم! ئاە، مەدینەکەم! خۆزگە دەتزانی چەند شانازیت پێوە دەکەم. هەستگەلی وا هەن لە مرۆڤدا بە ئاشکرا ناوترێن. بۆ خۆشم نازانم چ ناوێکیان لێ بنێم.

تەنها یەك داوام هەیە لە خوای گەورە: من پێش تۆ وەرگرێتەوە. ئەگینا هەرگیز بەرگەی پێچەوانەکەی ناگرم!.."

# بەشی دوازدەهەم

" ژیانی پڕ پەند و ئامۆژگاری گەنجێك كە بە عەرەبانەوە بەندە لێرەدا تەواو نابێت. ئەو سەرگوزەشتەی ژیانەی كە جارێك بە چاوی تەڕ و، جارێك بە دڵی گڕگرتووەوە خوێندمانەوە.

ئەم ئازاركێشەی كە ناوی جارانی ئومێد و ناوی ئێستای ڕەسوڵە، چەند مانگێك دوای ئەوەی گوێمان لە خۆی گرت كۆچی دوایی بۆ ژیانی هەمیشەیی كرد. بەڵام ئەمە دیمەنێكیماڵئاوایی وابوو كە دڵی زیندووی دەهەژاند و مرۆڤی ناچاردەكرد خۆزگە بە وەها مردنێك بخوازێت.

ڕەسوڵ لە ڕۆژانی كۆتایی تەمەنیدا نیشانەكانی كۆچی پێوە دەركەوتووە. بەجۆرێك چەندین جار چاوی خشاندووەتەوە بە ئامادەكارییەكانیدا. بەشێوەیەك كە چەندین ڕۆژ بێ ئەوەی خەو بچێتە چاوی نێوچەوانی لەسەر بەرماڵ هەڵنەگرتووە و دڵی لەو كەش و هەوا مەعنەوییەدا مەست بووە. مەدینەخان هەستی بەم ئامادەكاری گەشتە

کردووه و، هەموو کارەکانی هەڵپەساردووه و، بۆ ساتێك بە تەنها جێی نەهێشتووه. کۆتا داخوازی لە مەدینەی خێزانی داوا کردووه:

- تۆ شایانی کەسانی زۆر باش و بەنرخ و خاوەن پلە و پایەبوویت، کەچی تەمەنت لەگەڵ من بەفیڕۆ دا. نازانم لە دوارۆژیشدا هەر من هەڵدەبژێریت؟

مەدینە کە پارچەیەك ئاگر بووه، بە چاوی پڕ لە فرمێسکەوە لە وەڵامدا وتوویەتی:

- ئەوە تۆ دەڵێیت چی؟! تۆ نازانیت کە خوای گەورە لەبەر خاتری بێتاوانی و ستەملێکراوی تۆ منی بەم شوێنە گەیاندووه؟ تۆ نەبوویتایە لە خەویشدا ئەم هەموو بەخشش و ڕێزلێنانە خواییەم نەدەدی. کۆڵەواری و نەخۆشی تۆ چەندەها کەسی کرد بە خزمەتگوزار لە چواردەورتدا. ئەم جوانییانە پەیوەندییان بە منەوە نییە، بەڵکو هی تۆن. ئێستا من لە تۆ دەپرسم: تۆ کە خاوەنی ئەم هەموو دیاری و بەخششە خواییانەیت، لە بەهەشتە جوان و ڕازاوەکەتدا بە من ڕازی دەبیت؟

بەڕاستی ئەمە دیمەنێك بوو دڵانی دەهێنایە کوڵ و چاوانی لە فرمێسك پڕدەکرد.

ئەی خوای گەورە! تۆ لەو ژیان و گوزەرانانەی کە وا دەزانرێن ناشیرینن، چ جوانییەك دەخوڵقێنیت؟ لە ساتێکدا کە هەموو دەرگاکان داخراون و ڕێگاچارەکان نەزۆکن، چەند بەجوانی هیوا و ئومێد سەوز دەکەیت؟!

ماڵوێرانی بۆ ئەوانەی کە لە ڕەحمی تۆ نائومێد دەبن و، ئەوانـەی کـە نەفرەت لە ژیانی خۆیان دەکەن!

کۆتـا سـاتەکانی کـاك ڕەسـوڵ لـە زاری مەدینـەخانی خێزانیـەوە گوێبیست دەبین..."

خالید ئێرتوغروڵ

## شەوە پڕ ئەفسوونەکە

ئەو شەوەبوو.

ئەو شەوە تەژی لە ڕاز و نهێنییە...

هەرکاتێك ئەو شەوەم بەیاددا دێت کە ڕووداوە ڕازئامێزەکانی ژیرییـان دەستەوسان دەکرد، خوێنم دەیبەستێت و دڵم بەپەلە لێدەدات و، هەسـت دەکەم تەنگەنەفەس دەبم.

چۆن ئەو شەوەم لەبیردەچێتەوە؟

ئەو شەوە هەستێکی سەیرم هەبوو وەختێك لەسەر جێگەکەم ڕاکشام. ڕەسـوڵیش کـە زوو چـووبووە سـەر جێگەکـەی، لەوانەیـە ئـەوە یەکـەم جاربووبێت کە پـێش مـن خـەوی لێکـەوتبێت. لەحاڵێکدا هـەرگیز ڕەسـوڵ پێش من نەدەچووە نـاو جێگـا و قـەت پـێش مـن نەدەنووست. وەلێ لـەو دواییانەدا گۆڕابوو. ماوەیەکی زۆربوو خەو نەدەچووە چـاوی، کەچـی ئـەو شەوە زوو خەوی پیاکەوت...

وەك هەموو کاتێکی تر لەسەر تەپڵەکە بچووکەکەی نزیـك مێزەکـەی، پـەرداخێك ئـاو و قەڵـەم و کاغـەزی لەسـەربوو. سـەرەڕای پەککەوتـەیی،

ئەگەر شەوان تینووی ببوایە هەرگیز منی خەبەرنەدەکردەوە. شەوی وا هەبوو کە خەوی لێ دەتۆرا، بەرگەی هەستە بەرزەکانی ویژدانی نەدەگرت و دەستی دەدایە قەڵەم. ئیتر بەدەم فرمێسکەوە وشەکانی لە تەنیشت یەکەوە ریزدەکرد.

لەو تاریکییانەی شەودا دەربارەی خۆشەویستی خوا و ئەوینی پێغەمبەر ( دروودی خوای لەسەربێت ) و جوانی ئیمان و پەشیمانی لە تاوانەکانی، دەینووسی. جاری واش هەبوو خۆشەویستی پاکی بۆ من دەبوو بە باس و وەسفێکی دەکردم کە شایانی نەبووم. ئەم رۆحە پاك و بێگەردەی رەسوڵ دڵمی هێندە دەبزووانـد، کاتێك سەرم لە سوژدەدا دەنایە سەر بەرماڵەکەم، هەزاران جار سوپاسی خوام دەکرد لەسەر ئەوەی کە کەسێکی وای کردووە بە هاوبەشی ژیانم.

ئەو شەوە زۆر زۆر جیاوازبوو. دەتووت رەسوڵی کۆن نەماوە و یەکێکی نوێ هاتووەتە شوێنی کە یەکپارچە نوورە. ئەو شەوە سەرشاربوو لە خۆشەویستی پێغەمبەر ( دروودی خوای لەسەربێت ). نهێنیگەلێك لەو شەوەدا هەبوو کە نەمدەزانی چ ناوێکی لێبنێم. لەو شەوە رازئامێزەدا رەسوڵەکەم پێش من خەوێکی شیرینی لێکەوت، دەتووت پەروازی کردووە بەرەو جیهانێکی تر.

ئەو زریانەی کە ئەو شەوە ناخمی داگیرکردبوو، بەشێوەیەك کە پێشتر وێنەیم نەدیبوو، رۆحمی بریندار و ویژدانمی بیمار دەکرد. هیچ هۆیەك لە ئارادا نەبوو، کەچی دەتووت پشیلەیەکی بزێو بە چرنووکی تیژ

هەموو خانەکانم توێ توێ دەکات. ئەشکەنجەیەکی بێوێنەبوو و لە مشتیدا دەیگوشیم.

ئەو شەوە ڕەسوڵ حاڵی جۆرێك بوو. یەکەمجاربوو کە ئاخ و ئۆفی لێوە نەدەهات و ئازاری نەبوو. ڕوخساری پاك و جوان و نوورانی بوو. تا دەهات لەم بارە ناهەموارەدا ترس و دڵەڕاوکێ و دڕدۆنگیم زیادی دەکرد.

وەختێك من لەناو جێگەکەمدا لەگەڵ ئەم بیر و خەیاڵانەدا دەستەویەخەبووم، لەناکاو دەرگای ژوورەکەمان کرایەوە و گوڕزێك ڕووناکی سەرسووڕهێن ژوورەکەی پڕکرد. لە ناوەڕاستی ئەو ڕۆشنایییە پرشنگدارەدا زاتێکی باڵابەرز دەبینرا، وەلێ لەبەر بریقە و بریسکەی ڕووناکییەکە ڕوخساریم نەدەبینی. ئەوەندە سەرم سووڕما، لەجێی خۆم وشك بووبووم و واقم وڕمابوو. ئێستاش حەیران ماوم لەوەی کە چۆن دڵم بەرگەی ئەو ساتەی گرت و لە سینەم نەهاتە دەر.

ئا لەو کاتەدا نهێنییەکی تر ئاشکرابوو کە ئەوەندەی تر سەرسامی کردم. ڕەسوڵ کە چەشنی تەرمێك لە تەنیشتمدا ڕاکشابوو، لەپڕێکدا هەستایە سەرپێ و، وتی:

- بەسەرچاو گەورەم، من لێرەم.

ڕەسوڵ کە چەند ساڵێك بوو لە عەرەبانەکەی دوورنەکەتبووەوە، ئەمێستا قنج بەپێوە وەستابوو.

بڕوام بە چاوەکانم نەدەکرد. لە سەرسامیدا خەریکبوو لە هۆش خۆم دەچووم.

زاتە نوورانییەکە بە زمانێکی تەژی لە خۆشەویستی و میهرەبانی فەرمانی بە ڕەسوڵ دەدا:

ـ پێویستە بڕۆین، پەلە بکە!

ـ بەسەرچاو گەورەم! شەرەفێکی زۆر گەورەیە گەیشتن بە خوای خۆم، گەیشتن بە پێغەمبەری خوا، بە دۆستانی خوا، بە مامۆستاکەم... شەرەفێکی زۆر گەورەیە! ئێستا دێم گەورەم!

دەبوو ئەو زاتە نوورانییەی بەردەرگا فریشتەی گیان کێشان بێت. پارچەیەك لە ژیان و گیان و ڕۆحمیان هەڵدەگرت و پێکەوە ڕووە و جیهانی بەقا دەفڕین.

بەڵام من چۆن بەرگەی ئەو جوداییەم دەگرت؟! هۆشم وەستابوو و ژیریم کاری نەدەکرد. لە دڵی خۆمدا دوعام دەکرد و، دەموت: "خوایەگیان! کەواتە سەرچاوەی ژیان و هاوەڵی ئازیزم لێدەسەنیت. ئەی من، ئەی من کەی دەچم بۆ لای ئەو؟ توخوا زۆرم مەوەستێنە! ئەگینا بەرگەی ئەو حەسرەتە ناگرم! "

ڕەسوڵ وتی:

ـ گەورەم، ئەگەر مەدینە مردنی من ببیستێت زۆر خەمبار دەبێت. ئەگەر مۆڵەت بدەیت دەمەوێت بەئاگای بهێنم و گەردن ئازادی لەگەڵ بکەم.

ئەو زاتە پیرۆزە مژدەیەکی هێندە خۆشی دا، وەختبوو دڵم لە سینەم جوێ ببێتەوە. وتی:

ـ خۆ تۆ نەمردوویت! تۆ تەنها شەهید بوویت. شەهیدان ئازاری مەرگ ناچێژن. بڕوانە تۆش هەستت بە ئازار نەکرد. جگەلەوەش شەهیدان نـامرن و هەمیشـە لەگـەڵ خۆشەویسـتانیان دەژیـن. لەبـەر ئـەوە چ پێویسـت بـە گەردن ئازادی دەکات؟

ڕەسوڵ گیان کە هەرچەندی دەکرد نەیدەتوانی لـە مـن جیاببێتـەوە، داوایەکی تریشی هەبوو:

ـ هیچ نەبێت بـا تێبینیـەکی بچووکی بـۆ بنووسـم و بزانێـت کـە چـۆن مردووم، بۆ ئەوەی دڵنـەوایی بداتـەوە. ئـەگینا ئـەو بەرگـەی نـەبوونی مـن ناگرێت.

فریشـتـەی مـەرگ کـە بێگومـان ڕۆژێکـیش دێـت بـۆ سـەردانی مـن و سپاردەی گیانم لێ وەردەگرێتەوە، فەرمانی کرد:

ـ خێرا بینووسە!

بەپەلە ڕەسوڵ تاوی دایە قەڵەم و کاغەز... یەك لە دوای یەك وشە پڕ لە هەستە بەرزەکانی ڕیزکرد:

ـ تـۆ ئـەی کچـی خۆرهـەڵات... ئـەی فریشـتـەی جـوانی مـن... ئـەی دۆستی خوا... ئەی پاڵـەوانی ئیمـان... ئـەی ئـەو فریشـتـەیەی کـە دنیـا و دواڕۆژمی ڕزگارکرد! لە خوای گەورە داواکارم کە هەموو چاکەکانم بدات بە تـۆ و هـەموو خراپـەکانت لـە کـۆڵی مـن بنێـت. لـەپێناو تـۆدا ئامـادەی سـەختترین ئەشـکەنجەم، بگـرە ئامـادەم لـە دۆزەخـدا بسـووتێم، بـەس ئەوەندەی تۆ گەردنم ئازاد بکـەیت. کۆتـا داواکـاریم لێـت ئەوەیـە کـە: تـۆ

بوویت بە دیلی کەسێکی تاوانبار و کەمئەندامی وەك من. تۆ شایانی کەسانی پاك و باش بوویت. بە بۆنەی منەوە نەبوویت بە خاوەنی منالّی خۆت. هەرچەندە دەمزانی بە حەسرەتی منالّەوە دەسووتێیت و بە سروشت زۆرت حەز لێیەتی، کەچی قەت ئەو بابەتەت نەکردەوە.

ئاه، ئەی بەخششی دنیا و قیامەتی من! ئەی فریشتەی ژیان و خۆراکی گیان و شیفای زامانم! هیچ نەبێت بۆ ئەوەی دوای من کەمێك ئارامی و ئاسوودەییت دەستگیربێت، برۆ یەکێکی وەك خۆت دلّ و دەروون پاك بدۆزەوە و، لەنێو منالّەکانی خۆتدا بژی. رۆلّەی چاك و باش بۆ ئەم نیشتمانە پێبگەیەنە. هەرگیز دلّم گەرد ناگرێت و ناشکێت. گەردنت ئازاد دەکەم. دەتسپێرم بە خوای گەورە.

راپسکامە سەرپێ و تا توانیم قیژاندم:

ـ نەخێر!

لەو تۆفانە بێئامانەدا هاتمەوە هۆش خۆم و بینیم کەس لە ژوورەکەماندا نییە و رەسولّیش لە تەنیشتمەوە راکشاوە.

کەواتە خەوێکم دیوە، پڕ لە ئازار و هیوا، سەرشار لە ترس و ئومێد...

بەپەلە لە جێگەکەم هەستام. سینەم گڕی گرتبوو. بەسەر رەسولّدا نووشتامەوە. لەسەر لێوە وشك و ژاکاوەکانیدا خەندەیەك جێی گرتبوو، وەك بلّێیت لە جیهانێکی ترەوە مژدەیەکی وەرگرتبێت. ڕوخساری ڕۆشنی هەموو شتێکی ئاشکرا دەکرد.

له چرکەساتێکدا ڕۆحم بوو بە فرمێسك و دڵۆپ دڵۆپ لە چاومەوە هاتە خوار. هەنسکەکانم بینیان گرتم و قەستیان بوو بمخنکێنن. دیسان جارێکی تریش هەستم کرد کە دنیام ژێرەوژوور بووە. ڕەسوڵەکەم خەوێکی قووڵی لێکەوتبوو. بۆ یەکەم جار کارێکی بێ من کرد و تەنیا جێی هێشتم. گەشتێکی دوور و درێژی هەڵبژارد.

ڕەسوڵەکەم جەستەکەی لەوێ جێهێشت و گیانی بە سەربەستی لە جیهانی هەمیشەییدا هات و چۆی دەکرد. پێدەچوو ئەمێستا بە خۆشەویستەکانی شادبووبێت.

لەو ساتەدا بوومەلەرزە لە دنیا گچکەکەمی دا. لەو چرکەساتەدا هەستم کرد بووم بەژێر چەندەها قورساییەوە. قورگم تەنگ بوو و سینەم خەفە، پێدەچێت ئەوە ئەو شتەبێت کە پێی دەوترێت مردن. شل بووم و خەریك بوو دەبوورامەوە. دەنگم هێندە لەرزۆك بوو دەتووت گیان دەدەم:

- بۆچی تەنیا جێتهێشتم ڕەسوڵ گیان! کوا مەدینە بێ ڕەسوڵ دەبێت؟ بۆچی منیشت لەگەڵ خۆت نەبرد؟

چاوم چووە سەر پارچە کاغەزەکەی دەستی ڕەسوڵەکەم. چرچ و لۆچ بووبوو لە مشتیدا. دیاربوو چەند دێڕێکی شپرزەی بەپەلە نووسیوە. تەنها توانیم دێڕێکی بخوێنمەوە:

" کچی خۆرهەڵات، مەدینەکەم! لە دەرگای گۆڕەکەمدا چاوەڕێت دەکەم."

قیژاندم:

- بوەستە! توخوا بوەستە!...ڕەسوڵەکەم! منیش دەمەوێت شتێکت پێبڵێم:

سڵاوم بگەیەنە بە پێغەمبەری خوا و هەموو پیاوچاکان. تۆ ڕۆیشتیت، بەڵام هەمیشە لە دڵی مندا دەژیت. ڕۆحم لەگەڵ تابوتەکەتدا دەنێرم. بیرت نەچێت، تۆ یەکەمین و دوایەمین خۆشەویست و هاوسەرمیت. لەمەوداو هیچ پیاوێک نایەتە ژیانی کچی خۆرهەڵاتەوە. چونکە من لەگەڵ تۆدا لە خۆشەویستی و ئەوین تێگەیشتم. ئیتر دوای تۆ ژیانم تەنها و تەنها بۆ خزمەتی ئیمان و قورئانە.

ڕەسوڵ کە سەرتاپای تەمەنی بە ئازار و ناڕەحەتی بەسەربردبوو، شەوی جومعە دوایین هەناسەی دا و گەیشت بە میهرەبانی ڕەحمای خوا. لەم ڕۆژە تایبەتەدا کە ڕەحمەتی خوایی پتر بەندەکانی دەگرێتەوە، خوای گەورە دیاریی ڕزگاربوونی پێبەخشی. بەجۆرێك هەمووان ئیرەییان پێدەبرد و، کاتێك هەواڵەکەیان دەبیست چاویان پڕدەبوو لە گریان و، دوعایان دەکرد کە خوای گەورە مردنێکی وایان بەنسیب بکات.

هەڵبەت بێتاوانێك کە بەیانی تا ئێوارە لە کونجی ماڵەوەدا خەریکی سوپاسگوزاری خوا و تۆبەکردن بێت، هەر کۆتاییەکی ئاوای لێ چاوەڕێ دەکرێت.

## کەشتێکی پڕ ڕاز

سەرگوزەشتەی ڕەسوڵ کە لێوانلێو بوو لە ڕاز و نهێنی لێرەدا بەپایان دەگات، وەلێ ژیانی من بەردەوام بوو. بەڵام بەردەوامبوونێکی ئاسایی نا،

بەڵکو بەجۆرێك کە دڵانی دەهێنایە جۆش و، وانەی ئامۆژگاری بەوانە دەوتەوە کە گوێ ڕادەگرن و، لە پەند ڕادەمێنن..

دیسان شەوێك بوو لەو شەوانەی کە سوتانی ڕۆحم تیایدا دامرکاندنەوەی نەدەزانی ... بە خەیاڵی تاوتوتێکردنی ئەوەوە کە بە شێوەیەك پلانی هەوڵێکی گەورەو فراوان دابنێم بۆ گەیاندنی ڕاستەقینەکانی ئیمان و قورئان بەو دڵانەی کە پێویستییان پێیەتی، خەو بردمیەوە..

ئەو مەیدانی خەوەی کە لە بەردەممدا کرایەوە، ئەوەندە دنیایەکی ڕەنگاڵەیی بوو، چۆن بەرگەی دەگیرێت، نازانم!

ئەو زاتەی هاتە بەردەمم ، ئەوەبوو کە منی لە لێواری مەرگ گەڕاندەوە، سەرکردەی ئەو پزیشکە مەعنەوییانەی کە برینەکانی منیان سارێژکرد... سوڵتانی دڵەکان...

کە ئەو زاتەم لە بەردەمدا بینی، ئەوەندە پەشۆکام کە ددانەکانم بەیەکدا دان، ئیتر زمان و دەماغم وشکیان کرد. بەو دەنگە شیفا بەخش و بە بەرەکەتەی کە وەك زەمین لەرزە جیهانی مرۆڤ یاری پێ دەکات ، لەشێوەی فەرمانێکی زۆر جددیدا فەرمووی:

– کچم مەدینە، هاتووم تۆ ببەم. زۆر بە خێرایی خۆت ئامادە بکە. ئەمە وەکو بوون بە سەهۆڵ ، وەکو تاشینی بەرد وا بوو. ئەم تۆفانی پەرۆشیی و پەشۆکاوییەم منی لە کۆڵانەکانی مەراقدا هێشتبوەوە، ئەم

قسەیەی ئـەو زاتـەی کـە هێشـتا ناویشـیم نـەدەزانی، هـەموو دنیـای منـی سەرەوژێر کرد.

پەڕەیەکی تری پڕ نهێنی ژیان لەبەردەممدا کرابووەوە، بـەڵام ئەمـەیان بـۆ مـن گـەورەترین بەخشـش و مـەزنترین مـژدە بـوو. بـەڵام پەرۆشـیی و سەرسامییەکانیشم بەجۆرێك کۆتایی نەدەهات.

ئەو پیاوە نەناسراوەی کە ڕۆح و دڵی مرۆڤ ئاسودە دەکرد، وتی:

– خـەم مـەخۆ کچـم. هەمووشـتێك کـە کـاتی خـۆی هـات، دەیـزانین. ئێستا دەبێت پەلەبکـەین، بـەڵام ئەوەنـدەیت پێبڵێم تـۆ دەبیتـە میـوانی زاتێکی وا، کە ئەگەر ئێسـتا بتزانیایـە کـە لـە خۆشـحاڵیدا باڵـت دەگـرت و دەفرییت.

لەو ساتەدا، چوومە سوجدەی شوکرەوەو وتم: "خوایە شیاوم بکـە!" بەدڵێکەوە کە خەریکە لەناو قەفەسی سنگم دێتە دەرەوە.

ئەو پیاوە نەناسراوە بە وزەیەکەوە کـە لـەو تەمەنـەی ئـەو نـەدەهات وتی:

– دەی کچم مەدینە، دەڕۆین ... شوێنم بکەوە..

نەمزانی چۆن بوو... لـەناکاو دەرگـای ژوورەکـە ، وەکـو دووبـاڵی زۆر ناوازە، بە دەنگێکی گەورەوە کرایـەوە. ئـەو لەپێشـمەوەو منـیش لـەدوای ئەوەوە، لەناکاو خۆم لە دنیایەکی زۆر ڕەنگیندا دۆزییەوە.

گەش بووبوومەوە، خوێن لە بەدەنمدا دەسوڕایەوە... شتی وام لە ژیانمدا نەبینیبوو. ئێرە جێیەکی زۆر سەرنجڕاکێشە، ناوازەترین جوانی و ئەفسوناویترین کەش و هەوای هەبوو.

بە تەواوی لە شۆکی ئەو هەموو پەرۆشی و پەشۆکاوی و هەستی سەرسوڕمانانەمدا مابوومەوە...

ئێرە کوێیە؟ منیان بۆچی هێناوەو بانگێشت کراوی کێم؟ ئەو پیاوە نەناسراوەی کە لە ناڕەحەتترین کاتی ژیانمدا دەستی هاوکاری بۆ درێژکردم، کێ بوو؟!

ئەو پرسیارانەی کە مێشکمیان جەنجاڵ کردو، حاڵێکی بەرگە نەگیراوی بەسەر ئەو دڵەشمدا کە خەریك بوو لە لێدان دەکەوت، هێنابوو...

لە چەند چرکەیەکدا خۆم لەو جیهانە پڕ ڕازەدا ون کردبوو.. ئاشکرابوو کە ڕووداوگەلێکی پڕ نهێنی و جیاواز چاوەڕێی منیان دەکرد...

چیرۆکی ناوازەی ژیانی کچی خۆرهەڵات لێرەدا تەواو نابێت... ئەگەر ویستتان بزانن ژیانی مەدینەخان دواتر چۆن بەردەوام دەبێت و بە کوێ دەگات، تا کتێبی دووهەم ماڵئاوا و بە نیازی دیدار...

# پێڕست

# ŞARK KIZI

## HALİT ERTUĞRUL

پڕ ئازار و پڕ هیوا و پڕ نهێنی..
بەسەرهاتی ژیانێکی سەرسامکەرو دڵپڕوکێن..
کچی خۆرهەڵات، سومبولی لێبوردەیی و ڕاستگۆیی و خۆشەویستی..
لەبەرامبەر خراپەکاندا پاڵەوان و لەبەرامبەر چاکەکاندا گەردن کەچ..
ئازایەتیەکی وەك چیای قەندیل و.. ئەفسوناوی و پڕ نهێنی وەك چۆمی وان..
وەك دەریای ڕەش ون و پێچاو پێچ... وەك دەریای سپی بێدەنگ و بریقەدار..
خوڕ وەك دیجلەو فورات و، ستەمدیدە وەك ساکاریا.
کچی خۆرهەڵات .. کچی ئەم خاك و ئاوە..
هەموو دنیا بۆ باسکردنی ئەم گەرمی و ئەفسونە بەم خاك و ئاوە دەڵێن ((مەملەکەتی خۆرهەڵات))..
گەر دەتانەوێت خۆتان بدەنە دەست ڕووداوەکانی چیرۆکێکی پڕ پەندو نهێنی، فەرموون..
ئەم زریانی هەیەجانە ناختان دەهەژێنێ و دڵتان دێنێتە جۆش..
لە هەمووشی گرنگتر پەرۆشیتان دەگەیەنێتە لوتکە..
بە دڵنیایی تا تەواوی نەکەن، ناتوانن دەستبەرداری بن..
کچی خۆرهەڵات چاوەڕوانتانە..

ISBN 0-0103-0000-7




نرخی (٣٥٠٠) دینارە



ناوەندی ڕاگەیاندنی ئارا
ARA Media Center
ara.m@hotmail.com